# علوم الحدیث

# بە کوردی

# بۆ قوتابی ریگای نجات

نووسینی :قاسم محسن عولا

٢٠٢٢

# بسم الله الرحمن الرحيم

﴿رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا﴾ **الكهف ١٠**

## پيشەكى :

**الحمد الله نحمده ونستعينه ونستغفره ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادي له ، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له ، واشهد أن محمد عبده ورسوله .**

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾ **ال عمران ١٠٢.**

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ **النساء ١ .**

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا (٧٠) يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ **الاحزاب ٧٠-٧١ .**

**أمابعد :**

**فأن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدى هدي محمد ( صلى الله عليه وسلم ) وشر الأمور محدثاتها ، وكل محدثة بعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار .**

بی گومان زۆر بە پیویستی دەزانم  بە نووسینی ئەم پەرتووکە کە زانستیکی زۆر بە سوودە بۆ ئەو قوتابیە کە بەدوای زانستی شریعەت دەکەویت ،یان بە دوای راست دروستی فەرموودە کانی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) ویە ، ئەو کە زانایانی فەرموودە ناس باسایان کردووە ، کە چونیەتی راست دروستی فەرموودە کانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هەروە ها لە رووی ناسینی زاراوەکانی زانستی فەرموودە یان ( مصطلح علوم الحدیث ) ، بی گومان ئەم زانستە  یەکیکە لە هەرە گرینگە کانی شەریعەتی ئاینی ئیسلام ، چونکە ئاینی ئیسلام لە دوو سەرچاوە پیکهاتووە ،کە دەبیت ئەو کەسەی بە دوایی زانستی شەرعیەوە یە ریگای دروستی ژیانی خۆی وەرگریت ،بۆ ئەوە ی ریگەکەی بەرەو زرگار بوون بیت ،لە جاهلی و نەزانی لە شەریعتی ئاینی ئیسلام ، بی  گومان ئەوە ش دوو سەرچاوەی زانستە ،کە رزگارمان دەکات لە تاریکی نەفامی و نەزانی ،ئەویش یەکەم سەرجاوە قورئانی پیرۆزە ئەویش زانستیکە پی دە ووتریت ( علوم القران ) ئەوەی دووەمیش زانستی فەرموودە ناسیە ، کە هەموو  قوتابیە پیویستی بەم زانستە هەیە بۆ شارەزا بوون لە جۆنیتە فەرموود جۆن هاتووە جۆن بە دەست مان کەیشتووە ، بەلی زانستی فەرموودە ئەو زانستیە مەبەست لە گوفتار و کردار ) یان ( قول فعل ) پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کە لە لایەن هاوەلانیەوە بۆمان دە گیرنەوە ئەوانیش جیل لە دوای جیل بۆ ئیمەیان باس کردووە بە پی سەند هەروەك ئەو فەرموودانەی کە لە صحیحی بوخاری یان صحیح موسلم ئەوە ئەوانەی تریش کە شەش پەرتوو کە کەن بی گومان ئیمە وە موسلمان پشتیان پی دەبەستی لە دوای قورئانی پیرۆز ، ئەگەر جیاوازی هەبوو  لە سەر تفسیری ئایە تەکانی قورئانی پیرۆز ،ئەوە دە گەرینەوە بۆ فەرموودە کانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لەشەریعەتی ئیسلام پشتیان پی دەبەستین ، بەلی زانستی فەرموودە بە هۆی چەند بنەماو یاساو ریسا ( السند ) یان ( المتن ) پشتیان پی دە بەستین ،ئەویش کە گفتارو کرداور صفە ی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ، ئەو ( خبر ) یان ئەو هەوالەی کە لە هاوەلانەوە  بە ئیمە گەیشتووە ، پی دە ووتریت فەرموودەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کە گوفتار کردار و صفە دەدریتە پال  پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ،بەلی ئیمە ش لەم کتابە دا شیوەی زاراوەکانی زانستی فەرموودە روون دەکەینەوە بۆ ناسنی قوتابی ریگا نجات ، چونکە ئەوەی دەست بە فەرموودە کانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بگریت ئەو ریگا زرگاری یان جات وەردەگریت لە دونیاو لە ئاخیرە ت دا ، بە پشتیوانی خوای گەورە ، بە لی بیگومان فەرموودە ناسی یان دەست گرتن بە قورئان فەرموودە کانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) نیشانەی سەرکەوتنە  بۆ قوتابی ریگا نجات ،منیش بە پیویستم زانی ئەم کتابە بنووسمەوە ،بۆ ئەوانەی هۆگری فەرموودەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ زانست زانیاری شارە زابوون ، لە فەرموودە کان پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بەهیوام سوود بەخش بیت بۆ ئەوانەی کە ئەم پەرتووکە دە خوینەوە ، هیوادارم ، هەکەسیك سوودیکی لی بینی بلاوی بکاتەوە بۆ هەموو موسلمانان لەسەر رووی زەوی  دا بۆ ئەوەی لەم زانستە بی بەش نەبن ، تەنها مەبەستی  گەیاندین پەیامی خوا پیغەمبەرکەیەتی بە گشت موسلمانانی جیهان بۆ شارەزا بوون لە ئایینە  پیرۆزە کەی ئیسلام ، چونکە خزمەت کردن بە ئاینی ئیسلام و پەیامی خوا و پیغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم )  سەر بەرزی  و شانازیە بۆ هەموو موسلمانیك لە سەر رووی زەوی ، ئیمەی کورد بە موسلمانیەوە  سەر بەرز جوانین هەر ئەم ئاینەش ریگای رزگاریمانە بۆ دونیاو ئاخیرەتمان ، بۆ یە قوتابی رگای نجات ،لەبیر نەکەیت بەدوای زانست زانیاریەوە بە ، تاکو شکومەندو سەرکەوتوو بیت لە دونیادا لە ئاخیرەت پاداشتی بی وینەت دەست دە کەویت ئەگەر بە نیەتیکی پاك ،دەست بە دینەوە بگریت بەدوای زانیاری دا بگەریت ...

،هەروەك پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( إني أحدثكم بالحديث ،فليحث الحاضر منكم الغائب )).(١)

واتە :من كە هەوالتان پی دەدەم ،فەرموودەیە كتان بۆ باس دەكەم ، بائەوەی ئامادە یە بیگێریتەوە و بیگەینی بەوەی ئامادە نیە. جائەوی دەست بە فەرموودەی پیەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم )وە بگریت بی گومان ریگای نەجاتی هەلبژاردوە بۆخۆی ، چونكە ئەم ریگایە باشترین ریگاییە لە دونیا دا بۆ ئەوەی بگەی بە ( حەوزی كوثر ) لەگەل پێغەمبەری خودا ( صلى الله عليه وسلم ) دا بی ، هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنْفَعُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ الذاريات ٥٥ .واتە : یادی بكەرەوە چونكە یان كردنەوەی بەسوود بەنرخە گرینگە بۆ ئیمانداران ،بەلی فەزل و گەورەیی شوینكەوتنی فەرموودە كانی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) وە دەر نەچوون لە فەرمانە كانی ،' ئەمەش بە زانستی فەرموودەناسی شارەزایی فەزلی فەرموودە ئاینی ئیسلام شارەزا دەبین ،كە ( خوای گەورە ) دەفەر موویت : ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾النور ٦٣ . واتە : با بترسن و ئاگادر بن ئەوانەی پیچەوانەی فەرمانەكانی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەكەن ، لەوەی تووشی فتنە بن یان تووشی گومرایی و هاوبەش دانان بن ،وە تووشی سزایەكی توند دە بن لە دونیاو دوا رۆژ دا ..!! هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُهِينٌ﴾النساء ١٤ .واتە : هەر كەسیك سەرپیچی فەرمانەكانی پێغەمبەرە كەی ( صلى الله عليه وسلم ) بكات ، ئەو سنوورەی كە ( خوای گەورە ) دایناوە ،وە بی بەزینی ، ئەو خوا ئەیخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ، وە بە بەردەوام و هەمیشە تیدادەمینیتەوە ،وە سزایەكەی ریسواكەری بۆ هەیە ،بەلی ئەم ئایەتەی قورئان بەلگە یە بۆ ئەوەی كە فەرموودە كانی پێغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) گرنیگی زۆری هەیە بۆ موسلمانان ، وە هەر وە ها بەلگەشە بۆ ئەوانەی ئەم سەردەم ناویان لە خۆ ناوە قورئانەیە كان ، كە بایەخ بە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) نادەن ، ئەمەش ( خوای گەورە ) ریسوایان دەكات لە رۆژی دویدا ، بەلگەیەكی تری قورئانی پیرۆز كە فەرموودە كانی پێغەمبەر بۆ ژیانی ئیماندارو موسلمان زۆر بەسودو پیویست گرینكە ئەوەیە كە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾النساء٥٩ .واتە : ئەی ئەو كەسانەی كەباوەرتان هیناوە گویرایەلی خواو پێغەمبەرو فەرمانەكانی بكەن ، كە لەخودی خۆتان ، لە بیرو باوەر پابەندیدت ،خۆ ئەگەر لە شتیكدا بوو بە كیشە تان دەربارەی حوكمی خوایی ، ئەوە ئەو كیشەیە بگیرینەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەكەی ( صلى الله عليه وسلم ) كە ( قورئانی پیرۆزو فەرموودەكانی پێغەمبەرە ( صلى الله عليه وسلم ) ئەگەر ئیوە باوەرتان بەخوا بەرۆژی قیامەت دوایی هەیە ،رفتار كردنتان بەشیوەیە چاكترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری كیشە كانتان ...!!

---

١-سلسله احاديث صحيح

# ﴿فەزل و پەلەوپایەیی زانستی شەرعی﴾

(خوای گەورە) دەفەرموویت : ﴿وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾ طه ١١٤. واتە: بی ئەی خوای پەروەردگارم زانستی زیاترم پی ببەخشە ،وە زیاتر شارەزام بکە ..!!

هەورەها (خوای گەورە) دەفەرمووێت : ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾المجادلە ١١ . واتە : خوای گەورە پلە و پایەیی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە ، کە ئیمانیان هیناوە ،وە لە ئیوە ئەوانەی کە زانستیان پی بەخشراوە ،(ئەهلی علم و زانستن ) پلەو پایە یی بەرز دەکاتەوە بۆ پلەی زۆر بەرز تر ، (خوای گەورە )ش زاناو ئاگادارە بەوەی کە ئەیکەن بە ئاشکراو بەنهینی ..!!

هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾الزمر ٩ . واتە :ئەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) بلی : ئایا ئەوکەسانەی کە دەزانن و شارەزان ، وەك ئەوانەن کە هیچ نازانن و شارەزایان نیە ..؟! بەراستی تەنها خاوەن بیرو هۆشە کان لەم جۆرە یادە وەریانە سوود وەردەگرن و تیدەگەن ،لە حەقیقەتی دونیاو قیامەت دا ، وە دلنیابن ژیانی دونیا فەسە تیکی بەنرخە یان کاتیکی بەنرخە بۆ بەدەستهینانی رەزامەندی خوا بە کاری دەهینن ..!!

وه له فەرموودەیەکی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دا دەفەرموویت : (( من سلك طريقا يلتمس فيه علما سهل الله له طريقا إلى الجنة وإن الملائكة لتضع أجنحتها لطالب العلم رضا بما يصنع وإن العالم ليستغفر له من في السموان ومن في الأرض حتى الحيتان في الماء وفضل العالم علي العابد كفضل القمر على سائر الكواكب وإن العلماء ورثة الأنبياء إن الأنبياء لم يورثوا دينارا ولا درهما إنما ورثوا العلم فمن أخذه أخذ بحظ وافر )). (١) واته : هەر کەسیك ریگا یەك بگری بۆ ئەوەی زانستیکی لی بەدەست بهینی ، ئەوا ( خوای گەورە ) ریگایەکەی بۆ ئاسان دەکات بۆ بەهەشت وە فریشتە بالەکانی رادەخات بۆ فیر خوازی یان قوتابی زانستی شەرعی ، ئەوەی ئەیەویت زانستی شەرعی فیر بی ، لەبەر رەزامەندی بەوەی ئەیکات ، وە کەسی زانا یان عالم دوای لیخۆشبوونی بۆ دەکریت لە لایەن هەرچی لە ئاسمانەکان و ، وە لەسەر زەویە ،هەتاکو ماسیە کانیش لە ناو ئاودا داوی لیخۆش بوونی بۆ ئەکەن ،فەزلی زانا لە سەر بەندە وەك فەزلی مانگە لەسەر ئەستیرەکانی تروە ، زاناکان میرات گری کەلیان بەجی دەمینی زانستە ،جا هەرکەسیك ئەو زانستە ئەومیراتە وەربگری وە بەدەستی بینی ئەوە چاکترین و زۆر ترین نەسیبی بەر دەکەویت ..!!

هەروەها ( پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( نضر الله امرأ سمع منا شيئا فبلغه كما سمعه فرب مبلغ أوعى من سامع )).( ٢ ) . واته : خوا رووگەشی بکات و رووی بدرەوشیتەوە و بیخاتە هەموو خۆشیە کەوە ئەو کەسەی کە شتی ئە بیستیی لە ئیمە پاشان ئەیگەینی وەك ئەوەی کە بیستوویەتی لەوانە یە کەسیکی پیی ئەگەیەنری تیگەشتوو ترە و زانا ترە لەوەی بیستوویەتی ..!!

هەروەها لە فەرموودیەکی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( من كذب على متعمدا فليتوا معقده من النار )) . ( ٣ ) . واته :هەر کەسکی درۆیەك بەدەمی منەوە بکات با جیگای خۆی ئامادە بکات لە ئاگر دا .

هەروەها ( پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( من حدث عني بحديث يرى أنه كذب فهو أحد الكاذبين )).( ٤ )

واته :هەرکەسیك فەرموودەیەك بەناوی من بگیریتەوە بشزانی یان گومانی هەبی ئەوە درۆیە ئەوە یەکیکە لەدرۆزنان ...!!

---

١-رواه ابوداود، والترمذي و ابن ماجه ،والبيهقي في الترغيب والترهيب ص ٧٠ .

٢- الترغيب والترهيب ٨٩.

٣-رواه البخاري

٤-رواه المسلم

بەلی لەم ئایە تانەی قورئانی پیرۆز و ئەم فەرموودانەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ مان دەر دەکەویت کە زانستی شەرعی جەندە گرینگە بۆ موسلمانان ،هەروەها چۆن ئاو و هەوا پیویستە ئەواش زانستی شەرعی پوییستە و گرینگی زۆری هەیە لە رووی بیرو باوەرو ئیمانەوە ، هەروەها چوۆنیەتی خوا پەرستی کردنی بە تەنها و عبیادتە یاد کردتی یادی ( خوای گەورە ) فەرمان کردن بە چاگ و دوور کەوتنەوە لە خرا پە کاری ئەم بە گویرایەلی یان اطاعە ی خوا و ( پیغەمبەرەکەیەوە دەبیت ( صلی الله علیەوسلم ) وە شارە زا بوون لە زانستی شەرعی قورئانی پیرۆز فەرموودە کانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بەلی ( خوای گەورە ) پەلە پایەی هەلگرانی زانستی شەرعی بەرز کردۆتەوە لەنیوان موسلمانان دا ، بەلی تەنها شتیك كە ( خوای گەورە ) فەرمانی بە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کردووە ، ئەویش کە دوای زیاد بوونی بکات زانستی شەرعیە ..!!

بەلی هەروەك ئەوەی کە زاناو نەزان وەك یەك نیت ، یان چاوساغ وکویر وەك یەك نین ،یان تاریکی و رووناکی وەك یەك نین،بەلی بی گومان زانا پلە پایەی بەرزە کە بۆ خوای گەورە ئە نجامی بدات تەنها لەبەر خاتری بەرژەوەندی پەیامەکەی خوای گەورە پیغەمبەرەکەی بیت ( صلی الله علیه وسلم ) ئەوا پلە پایەی زانا بەرز دەبیتەوە لە لای ( خوای گەورە ) وەك مانگ وئەسیترەکان ،هەروەها دەبیتە رووناکی ناو گۆرەکەشی دوای مرنی ، بەلی تەنها زانایانی زانستی شەرعی لە خوا ئەترسن پشت پەنایەان بەخواوە هەیە ،زانست نیعمەتیکی یەکجار گەورەیە بۆ هەر موسلمانیك گەر بیەویت فیربیت شارەزای تەواوی لە ئاینەکەی هەبیت ئەوەش گەوهەریکی زۆر بەنرخی دونیە کە بەدستی دەهینی ،وە خیر چاکەیەکی بی هەژماری پی دەگات لەدوی خۆیدا ، ئەو کەسەی سوود لە زانستە شەرعیە کەی ببینیت ، بەلی زانایانی زانستی شەرعی ،خوا لە هەر هەموویان رازی بیت پاداشتی خیر و چاکەیان بداتەوە ، کە بوونەتە چرای زانستی شەرعی ئاینی ئیسلام جا لە سەردەمی هاوەلانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله وسلم ) دا تاکوو ئم سەردمە ،خوا پاداشتی خیریان بداتەوە کە ئەم ئاینەیان بە ئیمە گەیاند ،بەلی ئەو کەسەی ریگە بگریت بۆ زانینی زانستی شەرعی ئاینی ئیسلامی پیرۆز ،بەوەی کە پرسیار بکات لەم ئاینە دا یان ئەوەی سەفر بکات بۆ بەدست هینانی زانست یان ئەوەی بەدوای دا بگەری و کتابە کانی زانستی شەرعی بخوینیتەوە بۆ مەبەستی فیر بوونی یان سوودە وەرگرتن لی یان بەشداری بکات لە دروسی زانایان ووتارەکانی زانا یان یان بانگ خوازانی ئەم ئاینە ،یان خویندەوی کتابەکانیا،خۆی بۆ ماندوو بکات ،ئەو کاتە خوای گەورە ریگایی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات و وەریگای زانستیشی ۆ ئاسان دەکات ،بەلام هەر کەسکیك بیەوویت زانستی شەرعی فیر بیت ئەوا بۆ ریگای خوا و پیغەمبەرەکەی نەبیت یان بۆ بلاو بوونەوەی ئەم ئاینە پیرۆزەی ئیسلام نەبیت ،تەنها بۆ دونیا بیت ،بۆ ئەوەی بین بەخوا کەسکیکی زانایە ،بۆ بەرژەوندی دونیا بەکاری بینی ،ئەوا بی گومان بۆ نی بەهەشت ناکات کە ( ٤٠ ) سالە ریگایە ، چونکە بۆ دونیا فیری زانستی شەرعی بووە ، هەروەك پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هانی دواین کە قورئان فەرموودە کانی لەبەر بکەین ، هەروەها ئاگادرایشی کردووینەوە بەوەی کە درۆ بەناوی ئەوە وە هەلنەبەستین ، چونکە جیگامان دۆزەخە ، بە درۆ فەرموودە هەلبەستین ، جا لەبەرئەوەی فەرموود کان بەراست ودروستی بناسین دەبیت سەرەتایەك لەم زانستە فیربین ،ئەویش زانستی فەرموودە ناسیە ،و زاوەکانی فیر بین فەرموودە کانی پیغەمبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) بناسینەوە، لە رووی صحیح ی یان ضعیفی .................................هیتد

# پێناسەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم )

فەرموودە : بریتیە لە هەرشتیك كە بدریتە پاڵ پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) جا چ لە : ( قول ) واتە : ووتە و قسەو فەرمایشتە كانی ، یان ( فعل ) كردارە و كارەوە كانی كە ئەنجامی داوە بە كردار ، یان ( تقرير ) بڕیارو فەرمانەكانی كە ڕەزامەندی لە سەر شتیك یان كاریكی داوە ، یان ( صفه ) ئاوڵناو وەك شیوە و رووخساری پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ).

نموونەی فەرموودەی : ( قول ) یان ووتە قسە وگوفتاری ، پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی : (( من يرد الله به خيرا يفقهه فى الدين )).(١) .

نموونەی فەرموودەی: ( فعل ) كردار وەك دست نویژ هەلگرتنی ، پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە( ابن عباس ) وە – خوا لی رازی بیت – دەفەموویت (( انه بات عند خالته ميمونه ، فقام رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) من الليل ،فتوضا من شن معلق وضوءا خفيفا، قال : وصف وضوءه وجعل يخففه ويقلله ، قال ابن عباس : فقمت فصنعت مثل ما صنع النبي ( صلى الله عليه وسلم ) ،ثم جئت فقمت عن يساره ، فاخلفني فجعلني عن يمينه، فصلى ثم اضطجع فنام حتى نفخ، ثم أتاه بلال فاذنه بالصلاة ،فخرج فصلى الصبح ولم يتوضا . قال سفيان : وهذا النبي ( صلى الله عليه وسلم ) خاصة ،لأنه بلغنا أن النبي( صلى الله عليه وسلم ) تنام عيناه ولا ينام قلبه )). ( ٢ )

نموونەی فەرموودەی : ( تقرير ) بڕیارو ڕەزامەندی ، وەك دەربارەی یاری حەبشیە كان لە ناو مەزگەوتدا لە ( عائیشە )وە – خوا لی رازی بیت – دەفەموویت (( يومئذ يعني يوم لعب في المسجد ونظرت عائشة إليهم لتعلم يهود أن في ديننا فسحة إني أرسلت سمحت )) ( ٣ )

نموونەی فەرموودەی ( صفه ) ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە ( عائیشە ) وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (( ما كان الرسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) يسرد سردكم هذا ، ولكنه كان يتكلم بكلام يبينه ،فصل ، يحفظه من جلس إليه )) . ( ٤ )

---

١–راواه البخاری ، ومسلم

٢– رواه مسلم برقم ٧٦٣

٣– راوی ( عروه بن زبير ) المحدث الالباني سلسلة احاديث الصحيحة ، برقم ١٠٢٣ الصحفة ٦ .

٤–رواه الترمذي باب في كلام النبي ( صلى الله عليه وسلم ) برقم ٣٦٣٩ حديث ( حسن ) .

# ﴿ سەندی فەرمووده ﴾

بەلی لە هەموو پەرتووكەكانی میژوودا ، تەنها فەرموودەی پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) سەندو تا پۆیی هیە ، بەلی شیوازی گیرانەوەی فەرموودەكانی پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) لە هەموو گیرانەوەكانی تری میژووداجیاواز بووه ، بگره لە ئاینەكاتریش وەك ئاینەی جوولە كە ئاینی نصرانی ئاینەكانی جیهان یان گەلانی جیهاندا ، لە هەموویان باشتر بەهیز ترو وورترو ریك پیك ترو لەرووی گیرانەوەی دا ، بەلی ئەگەر سەیر كەین بۆ دەقە شرعیە كانی ئاینی ئیسلام ، لەدوای قورئانی پیرۆزه وه زاناكانی ئەم ئاینە پشت بە فەرموودەكانی دەبەست لە دوای قورئانی پیرۆز ،بە تاییە تی هەردوو صحیحە كە بوخاری و موسلم ، بەلی ( سەندی ) فەرمووده واتە : زنجیرەی ئەو كەسانەی كە فەرموودەكەیان گیراوەتەوە ،وە لە یەكترەوە ، بی گومان زۆر باش زانراوە كە كی لە كی وەر گرتووە لە رووی سەندی فەرموودەكەوە كەسە كان ناسراو و جیگای متمانە بوونە ، وە ئەوكەسەی كە جیگایمتانە نەبووە لە لای زانایانی فەرموودە ناس فەرموودەكەیان لی وەر نە گرتووە ، وە بی گوما شاهیدەكانیش دیار بوون ،وە خاوەنی متمانە بوون وە زیرەك بوون ،ئەمین خیانەت كارو دزو درۆزن نەبوونە ، بەلی ئەگەر سەیری پەرتووكە میژووە كانی تر بیكەین دە بینین جگە لە نووسەری كتبیە هیچ سەندیكی راست دروستی نیە ، جار وا هەبووە میژوو نووسیك بەسەر هاتیك یان گیرانەوەیە كی گیراوە تەوە چەندی سەدە پیش خۆی بووە ، بەلام هیچ ئاماژەی بەوە نەكردووە لە كیوە ئەم سەندی هیناوە یان لە كیوە رووداوە كەی وەر گرتووە ، بەلكو تەنها بە ئاماژە یان بەراو بۆ چوونی خۆی رووداوەكانیان گیراوەتەوە ،یان میژوو نووسان دەلین : ووتراوە یان دەلین ، یان شتیكی تر دەدەنە پال رووداوە میژوویەكە ، بەلام ئەگەر سەیری فەرموودە كانی پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) بكەین دەبینین هیچ لە ئاماژانەی تیدا نیە و ،وەرنەگیراوە لەلایان زانایانی فەرموودە ناس ، چۆنكە ئەم فەرموودەیە بە نادروست دەزانریت یان وەر نا گیریت ،لە بەشەكانی دا هاتوو دا باسایا لیوە دەكەین ، واتە ئەم دەستەواژانە بەكارنەهاتووە وە ك : ووتراوە یان بیستراوە یان ئەلین پیغەمبەر( صلی اللە علیە وسلم ) فەرموویەتی ......... ) بەلی ئەم جۆرە گیرانەوانە وەر نەگیراوە هە تاكو نەزانرابیت ئەم فەرموودانە لە كیوە هاتوون كی لە كی بیستووە ، كە ئەمەش پی ووتراوە ( سەندی فەرمووده ) ، هەر بۆیە( ابن مبارك ) – خوا لی رازی بیت- دەفەرموویت : ( لو لا الاسناد لقال من شاء ماشاء ) واتە : ئەگەر سەندی فەرمووده نەبوایە هەر كەسی چی بویستایە دە ی ووت دە نووسرایەوە ، ئەم دەبووە زیاد یان كەم كردن یان تیكەل بوونی شتی خورافیات كە هیچ پەیوەندی بە ئاینەوە نەدەما ، بەلی ئەگەر باسی سندی فەرمووده بكەین ، كە ئەو كە سەی سندی فەرمووده كەی لا بووە ، دە بوایە جەند مەرجیكی تیدابیت ،ئەگینا سەندی فەرمووده كەی لی قبول نەدەكراو وەرنەدە گیرا ، بەلكو جەندین مەرجیان دانا بوو بۆ وەرگرتنی سەندی فەرمووده كە ، بەلی ئەو كەسانەی كە لەناو زنجیرەی گیرانەوە كاندان تا بنتوان گیرانەوە كەی قبول بیت دەبیت جەند مەرجیكی هەبیت ..!!

**مەرجەكانی قبول بوونی سەندی فەرمووده كان پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەبیت ،ئەم خالەنەی خوارەیان هەبی:**

١- پیویستە كەسەكانی سندی فەرمووده ،ناسراو بن ،كەسایەتیەكی روون ئاشكرایان هەبیت واتە : ( مجهول ) نەبوو بن .

٢- پیویستە سالی لە دایك بوون و مردن و شوینی ژیانیان زانراو بیت .

٣- پیویستە كە سەكانی ناو زنجیرەی گیرانەوەكاندا وجیگای متمانە بن لە ناو خەلكدا ،بە رست گو ناسراو بن ،درۆ زن فیلاباز نەبوو بن ، گالتە و گەپ و قسەی هەلەق و پرو پوچیان نەبووبیت ، واتە : خاوەنی كەسایەتیەكی زۆر رەوشت بەرز بن لە ناو خەلكدا ...هتد

٤- پیویستە شیوازی لەبەر كردنی فەرموودەكانیان باش بو بیت ،كەسكی نەبوو بیت زوو شتی لەبیر چوو بیتەوە ، یان فەرموودەیان لی تیكەل پیكەل بووبیت .

٥- نابیت تووشی نەخۆشی لە بیر چوونەوە بن ،یان توانای لەبەر نەكردنی فەرمووده یان نەبوو بیت بەهۆی پیری یان نەخۆشی.

٦- پویستە سەندی فەرمووده كە بە یەكەوە بەستراوە بیت ،واتە كەسیك فەرموودەكەی لە كەسی پیش خۆی دەگیریتەوە ،وە پیویستە ئەو دوو كەسە یەكتریان بینی بیت ، هاوسەردەم بووبن ،وە لەریگای سالی لەدایك بوون و مردنیان زانراو ە بن .

بەلی ئەم مەرجانەو جەندین مەرجی تریش هەن بۆ سەندی فەرموودەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ، بەلی ئەم مەرجانە لە هەر كەسیك دابیت ئەوا فەرموودەیان لی وە رگرتووە ، بە سەندیكی صحیح قبولیان كردوە ، وە ك لە فەرمووده كانی صحیحی بوخاری و مسلم دا هاتوون ، كە سەندیان راست دروستە گیرانەوەكانیا ریك پیكە ، كە سە كانی ناو زنجیرەی فەرموودەكانی صحیح بوخاری مسلم و ،شەش پور تووكەكەی تریش سەندیان راست دروستە بەلام زیاتر بوخاری لە هرە هەموویان جیگای متمانە پی كردنی هەموو زانایانی فەرمووده ناسە لەدوای ئەویش موسلم ، لەدوای موسلم چوار پەرتووكەكەیتریش دیت ئەوانیش سەندی صحیح یان تیدایە بەشیوەیەكی راست دروست هیناویانەتەوە ،وە سنن النسائی ، سنن أبی داود ،سنن الترمیزی ، سنن ابن ماجە ، بەلی ئەمانە ناسراو ترین پەتووكی یان كتابی فەرموودەكانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هەر هەموویان زانای گەورەن لە گیرانەوە ی فەرموودەكان نووسینی ئەم شەش كاتبەی سوونە ، واتە فەرموودەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەشتوانین بلین ئەمانە شەش چرای ئاینی ئیسلامن بۆ ئەم ئومەتە ، چونكە هەموو ئەحكامەكانی شەریعەتی ئاینی ئیسلام لەدوی قورئانی پیرۆز پشت بەم شەش كتابە دەبە ستن ، حكم ئادابە كانی شەریعەتی ئاینی ئیسلام لەسەر ئەم شەش كتابە بونیاد دەدرین ، بۆیە فەرمووده لەژیانی هەر موسلمانیك كاریگەری زۆری خۆی هەیە ،چونكە ریگای رزگاری بۆ دونیا قیامەت بەدەست دەهین دە بیتە ریگای نەجاتی هەركەسیك گەردەستی پیوە بگریت ..........!!

نموونەی ئەم فەرموودەیەی کە ئیمامی بوخاری روایەتی دەکات :

حدثنا الحميدي عبدالله بن الزبير، قال : حدثنا سفيان ،قال : يحي بن سعيد الانصاري ، قال : اخبرني محمد بن ابراهيم ،أنه سمع علقة بن وقاص الليثي ، يقول : سمعت عمر بن خطاب على المنبر ،سمعت رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) يقول : (( غنما الاعمال يالنيات ، وإنما لكل امرى مانوى فمن كانت هجرته إلى يصيبها أو امرأة ينكحها ، فهجرته إلى ما هاجر إليه ))

( ١ ) .کەسانی ناو ئەم سەندی ئەم فەرموودەیە ناسراون ، با کەسی یەکەم وەر بگرین چۆن ناسراوە لە لای زانایانی فەرمودەناس

یەکەم کەس ناوی : ( عبدالله ی کوری الزبیری کوری عیسی کوری عبدالله ی کوری أسامە کوری عبدالله ی کوری حمید کوری نصر کوری الحارس کوری اسد کوری عبد العزی ) واتە : ئەگەر سەیری بکەن دەبینین یانزە پشتی زانراوە .

( عبدالله کوری الزبیر ) ناسراوە بە :( الحمیدی )

( عبدالله کوری الزبیر ) کونیە : ابو بکر .

( عبدالله کوری الزبیر )شوێنی لەدایك بوونی : مککە.

( عبدالله کوری الزبیر )وەفاتی : مککە .

( عبدالله کوری الزبیر ) سالی کۆچی دوای کردنی ( ٢١٩ ) هجری .

( عبدالله کوری الزبیر ) قوتابی ( ابن عیینە ) بووە .

ووتەی زانایانی ئیسلام لەسەر ( الحمیدی ) .

ئیمامی شافعی دەفەرموویت : کەسم نەبینیوە لە ( الحمیدی ) بەهیز تر بیت لە لەبە رکردنی یان ( حفظ ) کردنی فەرموودە.

ئیمامی ابو حاتم دەفەرموویت : ( الحمیدی ) متمانە پیکراوە ترین کەس بووە لە لای ( ابن عیینه ) وە پیشنگ بووە لە لای هاوریکانی دا .

ئیمامی احمد دەفەرموویت : ( الحمیدی ) پیشەوامانە .

ئیمامی ابن حبان دەفەرموویت : ( الحمیدی ) کەسیکی جی متمانەو خاوەنی ریزو دیندار بووە .

ئیمامی حاکم دەفەرموویت : ( الحمیدی ) کەسکیکی جی متمانەو ئەمین بووە ، کاتیك ئیمامی بوخاری فەرموودەیەکی لە بیستبیت ،ئیتر بۆ ئەو فەرموودەیە نەچووتەوە لای هیچ کەسیکی تروە چونکە جیگای متمانەی بوخاری بووە ٧٥ فەرموودەی لیوە وەرگرتووە.

ئەوە ش یەکەم کەسی زنجیرەی نیو گیرانەوەی فەرموودە کە، لە بەر دریژی بابە تە تەنها یەك کەسمان لی وەرگرتووە ،بی گومان هەر هەموویان زانراو ناسراو جیگای متمانە بوونە لەوەر گرتنی فەرموودەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم )

ئایا کام گیرانەوەی میژوو هەیە بەم شیوەیە کە سە کانی ناسراو جیگای متمانە بیت بۆ گیرانەوە ، کە میژووە کەی بگەریتەوە ١٤٤٤ سال پیش ئیستا ، بەم شیوەیە بووە ..........................................................................؟!

# ﴿شەش کتابە کەی فەرموودەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ﴾

**یەکەم : کتابی صحیح البخاری ناوی : (( الجامع المسند الصحيح المختصر من امور رسول الله وسننه وأيامه ))**




**ژمارەی فەرموودە کانی بوخاری ( ٧٣٩٧ ) بە فەرموودەی دووبارەوە .**

**هەروەها بوخاری ناوی تەواوی ( ابو عبدالله محمد بن اسماعيل البخاري )**

**بوخاری سالی لە دایك بوونی ١٩٤ کۆچی بەرانبەر بە سالی ٨١٠ زاینی لەدایك بووە .**

**وەفاتی بوخاری لە سالی ٢٥٦ کۆچی بەرانبەر سالی ٨٧٠ زاینی وەفاتی کردووە کە تەمەنی ٦٢ سال بووە .**

**شوینی لەدایك بوونی بوخاری لە شاری بخاری لە وەلاتی اوزپاکستان ئیستا ،**

**هەروەها ( حافظ الذهبي ) دەفەرموویت : لە دوای قورئانی پیرۆز کتابی بوخاریە خزمەت بە ئیسلام دەکات .**

**بەلی لە ریك پیکی گیرانەوە کانی فەرموودەکانی دا ( العداله والضبط ) تیدا بەدی کردووە ، دەگیرنەوە بە ( ١٦ ) سال ئەم کاتەبی نووسیوە تەوە کەتیدا ژمارەی فەرموودەکانی بە دووبارەوە کانیشەوە دە بیت ( ٧٣٩٧ ) فەرموودە ...!**

دووم : کتابی صحیح مسلم  ناوی  :(( المسند الصحیح المختصر من السنن بنقل العدل عن العدل عن رسول الله ( صلی الله علیه وسلم ) ..))




ژمارەی فەرموودەکانی مسلم ( ٧٢٧٥ ) بە فەرموودەی دووبارە وە

هەروەها مسلم ناوی تەواوی ( ابو الحسین  مسلم بن الحجاج القشیری النیسابوری  )

مسلم سالی لە دایك بوونی ٢٠٦ کوچی بەرانبەر بە ٨٢٢ زاینی .

مسلم سالی وەفاتی ٢٦١کوچی بەرانبەر بە٨٧٥ زاینی تەمەنی ٥٥ سال بووە وەفاتی کردووە .

شوینی لەدایك بوونی لە شاری نیسابور لە وەلاتی ایرانی ئیستا دا لە دیك بووە .

هەروەها کۆیی زانایانی فەرموودەی لەسەرە لەرووی راست و دروستی یان صحەتی فەرموودەکانی ریك وپیکی وەلە دوای صحیح بوخاریەوە دیت .

سی یەم : کتابی سنن النسائی ناوی : (( السنن الكبرى ))، (( السنن الصغرى ) ، (( المجتبى )) .



النسائی ناوی تەواوی ( ابو عبدالرحمن أحمد بن شعيب النسائی ) .

النسائی لەدایك بوونی لە سالی ٢١٤کۆچی بەرانبەر بە ٨٢٩زاینی .

وەفاتی النسائی لە سالی ٣٠٣ کۆچی بەرانبەر بە ٩١٥ زاینی وەفاتی کردووە تەمەنی ٨٩ سال بووە .

النسائی شوینی لەدایك بوونی لە شاری نسا لەوەلاتی ترکمانستان لە دایك بووە .

چوارەم : کتابی سنن ابی داود  کتابی بەناوی : ((  سنن ابی داود  ))




ابی داود ناوی تەواوی ( ابو داود السجستانی  )

ابی داود لە دایك بوونی لە سالی ٢٠٢کۆچی بەرانبەر بە ٨١٧زاینی لەدایك بووە .

وەفاتی ابو داود لەسالی ٢٧٥کۆچی بەرانبەر بە سالی ٨٨٨زاینی وەفاتی کردووە لە تەمەنی ٧٣ سالی دا .

ابی داود  شوینی لەدایك بوونی لە  شاری سجستان لەوەلاتی ایرانی ئیستا لە دایك بووە .

ژمارەی فەرموودەکانی ٤٨٠٠ فەرموودەیە  دیار ترین کتابی ابو داود (( سنن ابی داود ))

پینچەم : کتابی سنن الترمذي ، کتابی بەناوی (( جامع الترمذي )) ئەم کتابە سوودی یەکجار هەیە لەمەسەلی ( فقهە )




الترمذي ناوی تەواوی ( ابو عیسى بن محمد الترمذي )

الترمذي لەدایك بوونی لەسالی ٢٠٩کۆچی دا بەرانبەر بە سالی ٨٢٤ زاینی لە دایك بووە .

وەفاتی الترمزی لە سالی ٢٧٩کۆچی بەرانبەربە سالی ٨٩٢ زاینی وەفاتی کردووە لە تەمەنی ٧٠ سالیدا .

شوینی لە دایك بوون لە شاری ترمذ لەوەلاتی اوزپاکستانی ئیستا لەدایك بووە .

**شەشەم : کتابی سنن ابن ماجە ناوی : (( الامهات کتاب ))**




**ابن ماجە  ناوی تەواوی ( محمد بن ماجە )**

**لەدایك بوونی لە سالی ٢٠٩ کۆچی دا بەرانبەر بەسالی ٨٢٤ زاینی دا .**

**وەفاتی ابن ماجە لە سالی ٢٧٣ کۆچی دا بەرانبەر بەسالی ٨٨٦ زاینی دا وەفاتی کردووە لە تەمەنی ٦٤ سالیدا .**

**شوینی لە دایك بوونی ابن ماجە لە شاری قەزوین لەوەلاتی ایران ئیستا دا لەدایك بووە .**

**ژمارەی فەرموودەکانی ابن ماجە ٤٣٤١ فەرموودە یە.**

**تیبینی / کتابی(( ابن ماجە (کفایه الحاجه فی شرح ابن ماجە ))، (( مصابح الزجاجه علی سنن ابن ماجە ))للسیوطي .**

**(( الکواکب الوهاج بشرح سنن ابن ماجە ) لمحمد المنتقی الکشناوي .**

# ﴿ئایا چۆن بزانین ئەم فەرموودانەی كە بە ئیمە گەیشتوون صحیحن ؟﴾

بی گومان ئەم پرسیارە لە بنچینەدا دورست كراوی دوژمنانی ئیسلامە ، ئەكینا ئەوەوی باوەری تەواو دامەزراوی هەبیت باوەر بەم پرسیارە ناكات بەلام لە بەر گرینگی فەرموودە ئەم پرسیارە دینە ئاراوە بۆ ئەوەی هیچ گومانیك لە راست و دروستی فەرموودەكانی پیشەوای مرۆڤایەتی نەمینیت ، بی گومان ئەوانەی كە گومانیان هیە لە چۆنیە تی پی گەیاندنی فەرموودە بە ئیمەی موسلمان چۆن پیمان گەیشتووە ، ئەو جۆرە كەسانە لە ژیر پۆشاكی ئیسلامدا خۆیان حەشارداوە ، بۆ هەمیشە لە بۆسە دا بۆ پەیرەوانی ئاینی ئیسلام ، فەرموودەكانی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) ، بەلام لە راستیدا موسلمان پیویستە بە هیچ جۆریك گومانی لە پی گەیشتنی فەرموودە كانی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) نەبیت ، چونكە هەموو ئە فەرموودانە بە سەندیكی صحیح و راست و دروست لە هاوەلانی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) وەر گیراوە دواتریش لەتابعین دواتریش لە تابعی تابعین وەرگیراوە ، بەلی وەر گرتنی فەرموودەش لە باسە كانی پیشتردا باسمان كرد ئەوەی فەرموودەی لی وەر گیراوە دەبیت بە چەند مەرجیك دا تی پەریت ،ئە گەر ئەو مەرجانەی نەبیت ئەوە فەرموودەكە بە (مردود ) ناپەسەند دادەنریت ، ئە گەریش مەرجەكانی تەواو بیت فەرموودە كە بە (مقبول ) دادەنریت یان بەسەند دەكریت ، بەلی ئەمەش لە زانستە كانی فەرموودە تۆمار كراوە (علوم الحديث ) ،بی گومان دەبیت ئەوەش بلین كە نووسینەوەی فەرموودەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە دوای وەفاتی پیغەمبەری سەروەرمان بە یەكجاری نە نووسرایەتەوە بەلكو بە چەند قوناغیكدا تیپەریوە ئینجا بە تەواوەتی نووسراوە تەوە ،ئیمەش لیرەدا بە كورتی باسی قۆناغەكان دەكەین :

**قوناغی یەكەم :** وەك ئاشكرایە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە سەرەتا دا ریگری لە فەرموودەكانی خۆی كرد كە نەنووسرینەوە ،ئەویش لەبەر چەند هۆكاریك و كە زانایانی فەرموودە ناس دیار تریان بۆ ئەوە دەگەرینەوە ، كە ریگری بكریت لە تیكەل بوونی فەرموودە بە قورئانی پیرۆز، وەك لە فەرموودەكەی (ابو سعيدى خدرى ) –خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : (( لا تكتبوا عني ،ومن كتب عني غير القران فليمحه وحدثوا عني ،ولا حرج ، ومن كذب علي – قال همام : أحسبه قال : متعمدا – فليتبوا مقعده من النار )) (١) واتە : هیچ شتیك لە منەوە مە نووسنەوە ،هەر كەسیك شتیك بنووسیت لە منەوە جگە لە قورئانی پیرۆز، ئەوا با بیسریتەوە ، قسەی من بگرینەوە قەیناكە هەركەسیكیش بە زمانی منەوە درۆ بكات ، همام ئەلی : وابزانم فەرمووی : بە ئەنقەست ، ئەوا باشوینی خۆی لە دۆزەخ دا ئامادە بكات .

---

١-رواه مسلم برقم ٣٠٠٤ .

بەلی بەلام ئەم فەرموودەیە ئەوە ناگەیەنی کە فەرمووده حفظ نەکرابیت یان لە بەرنەکرابیت ، وەك قورئانی پیرۆز ،چونکە فەرموودەکە ئەلی هەر کەسیك قسەیە کی منی بیست ئەوا با بیگیریتەوە بە جوانی قەسە کەی من بگەینی ،ئەمە ش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەلەسەردەمی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) نووسراوە تەوە ، بەلکو لەبەر کراوە یان حفظ کراوە ، چونکە سەردەمی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) سەردەمیکی زیرین بوو ، بۆ رەوان بیژی و یان بلاغە شیعر ، خەلك لەم سەردەم دا بە سەتان بیتی شعریان لە بەر دەکرد هەندە پیویستی بە نووسینەوە نەبوو ، بەلکو قورئانی پیرۆزیش کاتی دادبەزی هاوەلان یەکسەر حفظ یان دەکرد یان لەبەریان دەکرد ،دواتریش هاوەلان بە بەردەوام لە لای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بوونە هەم بۆ ئەوەی کە قورئان پیرۆز دادەبەزی حکم و شریعەتی واجب فرض یان لي وەردەگرت ئەمەش بە فەرمودەکانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەم سەردەم جیاواز بووە هاوەلان زیرك و هۆشمەند بە سەریقە بوون ، تواناي شت لەبەر کردنیان زۆر بووە ، نەوەك ئیستا کە پیاو نازانیت دوینی جی خواردوە بەهۆی ئەم هەموو تەکنەلوجیا یەی ئەم سەردەمەدا ، بەلگەیەکی تر کە لەەفەرموودە یەکی ( عبدالله ی کوری عمری کوری عاص ) – خوا لی رازی بیت – دە فەرمووی : (( كنت أكتب كل شيء أسمعه من ورسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) أريد حفظه ، فنهتني قريش وقالوا : أتكتب كل شيء تسمعه و روسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) بشر يتكلم في الغضب والرضا؟ فأمسكت عن الكتاب ،فذكرت ذلك لرسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) ،فأوما بأصبعه الة فيه فقال : ( كتب فوالذي نسي بيده ما يخرج منه الا حق )) . (١) . واته : هەر شتیکم لە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ببیستایە هەموویم دەنووسیەوە هەتا لە بەری بکەم بیپاریزم لە فەو تاندن ، قورەیش ریگریان لی کردم ووتیا : تۆ هەمووشتیك دە نووسیەوە کەلە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەبیستی لە کاتیدام ئەویش مرۆڤە لە کاتی توورە بوون و ئارامی و ئاسایی دا قسە دەکات ؟ ئیتر منیش وازم لە نووسین هینا ، باسە کەم بۆ پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) گیرایەوە ، جا پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە پەنچەی دەستی ئاماژەی کرد بۆ خۆی و فەرمووی : بنووسە سویند بە ( الله ) ئەوەی هەق و راست نەبی لەم دەمە دەر ناچیت . کەواتە لەەسەردەمەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموودە نووسراوە تەوە بەلام بەشیوەیەك نەبووە وەك قورئانی پیرۆز بنووسریتەوە چونکە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە ناویان دا بووە ، هەروەها لە ( ابو هریره ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (( لما فتحت مكة قام النبي ( صلى الله عليه وسلم ) فذكر الخطبة النبي ( صلى الله عليه وسلم ) قال : فقام رجل من اهل اليمن يقال له أبو وشاة فقال: يا رسول الله اكتبووا لي . فقال : اكتبووا لأبي شاه )). (٢) . واتە : دوای ئەوەی کە شاری مککە رزگار کرا ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هەستا ووتاری بۆ دان ،باسی ووتارەکەی کرد ،ووتارەکەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) راوی ووتی : پیاوی لە خەلکی یەمەن پیان دووت : ( ابو شا ) هەستا ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیهوسلم ) فەرمان بدە کە ئەم ووتارە بنووسنەوە ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : بنووسنەوە بۆ ( ابو شاه ) .

---

١- سنن ابي داود ٣٦٤٦ .

٢- سنن ابي داود٣٦٤٩.

هەروەها كوو ئەو هاوەلانەی كە فەرموودەی پیغەمبەری خوا یان (صلی الله علیه وسلم ) گیراوەوەتەو یان نووسیوەتەوە ، وەكو (جابوی كوری عبدالله ) ، ( ئەنسی كوری مالیك ) ، ( ابو هریره ) ، ( سەمرەی كوری جندب ) ، ( عبدالله كوری ابی وفا ) ، (ابو موسی ئەشعەری ) ، (عبدالله كوری (عباس ) ، (عبدالله كوری عمر ) جەندی هاوەلی دیكەش –خوا لی یان رازی بیت – بەلی لە كاتیك دا نووسین لەلای شتیكی نوی بووە ، بەلام پیش هاتنی ئیسلام زۆر گرینگیان بە گیرانەوەی (الروایه ) و بۆ پاراستنی شعیرو ووتارە كانیان رەچەلەكی خۆیان ، وە بەهەرەیەكی حفظ كردن و لەبە ركردنیان زۆر بووە ، بەلام دە بیت ئەوەمان لەبیر نەچیت ئەو نووسینانەی كە سەردەمی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) نووسراونەوەتەوە هەلی تاكەكەسی بووە نەوەك گشت گیری هەموو صحابەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) بووە ،وەك : نووسراوی (صحیفه ) كە نووسراویكی (عبدالله ی كوری عمری كوریی عاص ) بووە – خوا لی رازی بیت – كە (ابن الاثیر ) باس دەكات لەكتابی (اسد الغابه ) دەلیت : ١٠٠٠هەزار فەرموودەی تیدا نووسرا بووە .(١) ، هەروەها (صحیفه ) (جابری كوری عبدالله ئەنصاری ) جگە لەوەش كتابیكی هەبووە تیدا باسی شیوەی حەج كردنی كردووە ، یان كتابی (الصدقات ) پیش وەفاتی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) نووسیەتی ،بەدریژایی باسی خیرو زەكات دەكات ، دواتر دەكەویتە دەست ی(ابو بكر صدیق ) دواتری (ئەنسی كوری مالیك ) – خوا لی یان رازی بیت ، هەروەها كتابی (عمری كوری حەزم ) ئەویش (صحیفه ) یە ك بوو ە كە لەسالی ١٠ كۆچی دا نووسیویەتی ،زۆر بەی بابەتەكانی ئابووریە یان بابەتی پیویست بەتاوان تاوانكاری باس كردووە، یان (صحیفه )ی (علی كوری ابی تالیب ) – خوا لی رازی بیت – ئەویش بابەتەكانی باسی تاوان و زەكات دەكات ، یان ئەو نووسراوانەی كە لە پەیمانی حودیبیە دا نووسراو بوونەوە ،یان ئەو نامانەی یان نووسراوانەی كە بۆ پادشاو سەرۆك هۆزەكان رەوانەكران ، یان ئەو نووسراوانەی كە دوی وەفاتی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) وە ك تابعین یان شوینكەوتوانەوە ، وەك: (محمد مصطفی الاعضمي ) كة تابیعن بووە ، كە ناوی كتاب (دراسات في الحدیث النبوی وتاریخ تدوینه ) یان كۆمەلیك لە و نووسراوانەی كە تابعین نووسیانە وەك :

(صحیفه ) (سعیدی كوری جبیر ) كە قوتابی (ابن عباس ) بووە، هەروەها (صحیفه ) (مجاهدی كوری جبری مكی ) كە قوتابی (ابن عباس ) بووە ، یان (صحیفه ) ی (ابو زبیری محمدی كوری مەسلمه ) كە قوتابی (جابری كوری عبدالله ) بووە .......هتد

بەلی ئەم نووسینووصحیفه و پەرتووكانە بەشیكی زۆری سوونەت و فەرموودەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) پیك دەهینن ، هەروەها زۆریش لە هاوەلان فەرموودەكانیان بە زۆری لە بەر بووە یان لە سینگیاندا حفظ بووە ، هەر ئەمەش بووە بۆ هۆی بلاو بوونەوەی فەرموودەكانی پیغەمبەری خوا لە وەلاتانی جیاجیا ئا ئەوەتا لە وەلاتی عیراق ایران و اوزباكستان هیند و توركیای وەلاتی شام وەلاتی ئەلبانیا وەلاتانی تری جیهان دا ....هتد

---

١-ابن الاثیر (اسد الغابة ).

**قوناغی دووەم :** ئەم قوناغە بەچەند ئاماژەیەك یان نیشانەیەك جیادە کریتەوە ، کە دیارتریان ئەوە کە لەسەردەمی خلیفە( عمری کوری عبدالعزیز ) – خوا لی رازی بیت – بەشیوەیە کی رسمی و بە فەرمانی خۆی داوی کردووە کە فەرموود کانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بنووسریتەوە ، ئەویش لە سالی ۹۹ی کۆچی دا بووە ، دیارە تەماشای ئەو بارەدۆخەی کردوە کە ئومەتی ئیسلام لە سەردەمەدا پی دا تیدەپەریت ،ئەویش – خوا لی رازی بیت – بە پیویست زانی فەرموودە بنووسریتەوە ، کە نووسراوی کرد بۆ ئەمیر فەرماندە و حاکمە کانی دەولە تی ئیسلامی لەسەردەمی خۆی دا ، کە فەرموودەکانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کۆ بکریتەوە ، چونکە ئەو مەترسیانەی کە پیشتر هەبوو ، لەسەردەمی ( عمری کوری عبدالعزیز ) دا نەما بوون ، بەلی نووسراوی کرد بۆ فەرماندو کاربەریکەرەکانی شارە کان کەفەرموودە بنووسنەوە ، لەوانەش حاکمی یان قازی شاری مەدینە ،ئەوکاتە ( ابو بکری کوری حەزم ) بوو و کە دوای لی کرد بەم کارە هەلسیت ئەویش پی فەرموو : ( انظر ما کان من حدیث رسول الله ( صلی الله علیه وسلم ) فاکتبه فإني خفت دروس العلم وذهاب العلماء ) ) واتە : تەماشاکە هەرچی فەرموودەی پیغەمبەری خوا یە ( صلی لله علیه وسلم ) بی نووسەوە ، بەراستی من لە نەمانی زانست و لەناو چوونی زانایان دەترسم ، وە یەکیکی تریش کەئەم نووسراوەی بۆ کرد ( محمد کوری مسلیمی کوری شهاب زوهری ) بووە کە لەسالی ۱۲٤ کۆچی دا وەفاتی کردووە ، کە زانایەکی بە ناوبانگی وەلاتی حیجاز بووە لەو سەردەم دا ، ئەویش وەلامی دایتەوە وەك ( جامع بین العلم وفضله ) هاتووە کە ابن شهابی زوهری فەرموویە تی : ( عمرەی کوری عبدالعزیز ) فەرمانی پی کردین کە فەرموودە کۆبکەینەوە ئیمەش نووسیمانەوە دەفتەر دەفتەر ناردمان بۆ ئەو شینانە کە دەسەلاتی دەولەتی ئیسلامی لی بوو ، بەلی بەم شیوەیە بەرسمی نووسینەوەی فەرموودە دەستی پی کرد ، شایانی باسە قوناغی یەکەم و قوناغی دووە م هەردوو لەسەدەی یەکەمی کۆچی دا بووە ، چونکە عمری کوری عبدالعزیز لە سالی ۹۹کوچی دا وەفاتی کردووە ، جینیشنی دوای خۆی لە سالی ۱۰۱ کۆچی دا هاتە شوینی عمری کوری عبدالعزیز ،بەلی لەم قوناغەدا واتا قوناغی دووەم نووسینەکانە تەنها بریتی بوون لە کۆکردنەوەی فەرموودە کان بی ئەوەی بە پی ناونیشانی زانستی فەرموودە جیا بکرینەوە و پۆلین بکرین تەنها کۆکردنەوە بوو ،بەلی لە سەردەمی عمری کوری عبدالعزیز دا ، قوناغی دووەمی فەرموودە دەست پی دە کات ، بلام ئەگەر سەیر بکەین لە هەردوو قوناغی یەکەم قوناغی دووەم لە سەدەی یەکەمی کۆچی دا بووە ، کە فەرموودە کۆ کراوە تەوە ، ئەویش بە فەرمانی عمری کوری عبدالعزیر کە ئەو کات خلیفەی موسلمانان بووە ، لەم سەردەمەشدا زۆر بەیان هاوەلانی پیغەمبەری خوا یان ( صلی الله علیه وسلم ) بینیووە چونکە سەردەمی تابعین بووە ، هەربۆیە فەرموودە کانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە سەندیکی زۆر راست دروستەوە بە ئیمە گەیشتووە ، ئەگەر سەیری نووسراوەکەی عمری کوری عبدالعزیز بکەین ، لە سەردەمی خۆی دا بۆ هەموو ئەو شوینانەی ناردووە کە لەژیر دەسلاتی خۆی دابووە ، چونکە وەفاتی عمری کوری عبدالعزیز ۹۹کۆچی دا بووە کەواتە سەردمی قوناغی دووەم دەست پی دەکات ئەویش لە سالی ۱۰۱ کۆچی دا بووە کە دوای جینیشینی عمری کوری عبدالعزیز وە دەست پی دەکات ،بە هەمان شیوە ئەم قوناغەش قوناغیکی زرین بوو ،چونکە قوناغی تابعی تابیعن بوونە ..!؟

**قوناغی سی یەم :** بەلی لە سەدی دووەمی كۆچی دا دەست پی دەكات كە دەكاتە سەردەمی ( محمد ی كوری موسلیمی كوری شهابی زوهری ) بووە ، چونكە ئەو كەسانەی هاو سەردەمی ( زوهری ) بوون یان ( زوهری ) یان بینووە ، یان قوتابی ( زوهری ) بوونە ، بەلی ئەم سەردەمە بە قوناغی پولین كردن یان ( تنفیف )ریخستن دادەنریت ، یان ( ترتیب علی الابواب ) بەلی لەم سەردمەدا كۆمەلی كتیب نووسراو نەتەوە ، وەك ( جامع ) ابن جریج لە سالی ٨٠كۆچی لەدایك بووە لەسالی ١٥٠كۆچی دا وفاتی كردووە ، ئەویش لە گەل ( زوهری ) دا بووە بەم كاتبەلە سالی ١١٠یان ١٢٠ كۆچی دا نوسراوە ، هەروەها كتابی ( جامع ) ی ( معمر بن راشدی یەمەنی ) لە سالی ٩٥كۆچی لەدایك بووە ، لە سالی ١٥٢ كۆچی وەفاتی كردووە ئەم كتابە ئەو پیاوە نزیكە ( ١٦١٣ ) فەرموودەی تیدا نووسراوەتەوە ، یان كتابی ( جامع ) ( سفیان الثوري ) ئەویش لە سالی ٩٧ كۆچی لە دایك بووە لەسالی ١٦١ كۆچی وەفاتی كردووە ، ئەو پیاوە لە گەورە زانایانی فەرموودە ناس بووە لە عیراق دا نزیكەی ( ٣٠٠٠ ) هەزار فەرموودەی ئەسەری لە بەر بووە ، هەروەها ( موطا ) ( ئیمام مالیك ) لەسالی ٩٣ كۆچی لە دایك بووە ،لەسالی ١٧٩ وەفاتی كردووە كە نزیكە ی هەزار ١٠٠ فەرموودە یان ٢٠٠٠ هەزار ئەسەری تیدایە ، یان سنن ( ابن ربی عوربە ) یان جامع ( سفیان بن عیینە ) بەلی ئەمانە قۆناغی سی یەمن بەلام لەدوای قوناغی سەیەم قوناغی چوارەمەی كۆكردنەوەی یان پولین كردنی فەرموودە دەست پی دەكات .

قۆناغی چوارەم : بەلی ئەم قۆناغە لە سالی ١٥٠ كۆچییەوە دەست پی دەكات ، دەكریت ئەم قۆناغە بە قۆناغیكی گرینگی نووسینەوە فەرموودە و شی كردنەوە راڤە كردن و ریخستنەوەی پۆلین كردنی فەرموودە كانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیەوسلم ) دادەنریت ، چونكە لەم قۆناغەدا موسوعاتی فەرموودە ی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرەوان بوو، كە پیشتر ئەوەی بە خۆ وە نەبینی بوو ، لەم سەردەمەدا زانایان نووسین و كتیب وفەرموودەكانیان لە شیخەكانی پیش خۆیان دا وەرگرتبوو ، هەروەها كۆكردنەوەی فەرموودە كان لەسەر ناو نیشانی فقهە ی شەریعتی ئیسلامی ، بۆ نموونە : ( مصنف ) ی ( عبدالرزاق صنعانی ) لە سالی ١٦٠ كۆچی دا دەری كردووە ، ئەم مصنفە لە مامۆستاكانی پیش خۆی نوسیویەتەوە ، وەك ( عمر بن راشد ) ، مالیك بن ئەنس ) ( سفیان ) ( ابن جریج ) ..هتد ، ئەم كتابەی ( عبدالرزاق ) ٤٠٠٠٠هەزار گیرانەوەی لە خۆ گرتیە ، كە پیكهاتووە لە فەرموود كانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هاوالانی و فتواو قسەی شوینكەوتوان لە خۆ دە گریت ..!!

هەروەها كتابی ( الام ) كە كتابی ( ئیمامی شافعی ) كتبیكی زۆر گرینگ و گەورە وبەسوودە ئەویش لە پیشەواو شیخەكان و مامۆستاكانی پیش خۆی وەری گرتووە وەك ( ئیمام مالك كوری ئەنس ) ، ( ابن عوییئە ) ، ( ابن جریج ) جگە لەمەش لە كتبكەیدا ٣٠٠٠هەزار فەرموودەی وە ١٠٠٠هەزار ئەسەری لە هاوەلان شوینكەوتوان وەرگرتووە ، هەروەها كتابی ( ابن ابی شیبە ) كە بە ( مصنفی ) ابی شیبە ناسراوە ئەو پیاوە قوتابی ( عبدلرزاق صنعانی ) بووە كە ٤٠٠٠هەزار گیرانەوە لە خۆ دە گریت ..!

بەلی دوای ئەم نووسراوانە جۆریکی دیکە لە خزمەت کردنی فەرموودەکانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هاتە کایەوە ، ئەویش خۆی لەوەدا بینیەوە کە فەرموودەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بە تەنها لەو نووسراوانە دەربهینریت ،ولە فەرمووده کانیشدا تەنها ( مسند متصل ) واتە: ئەو فەرموودەیەی کە بە زنجیرە یەکی گریدراوی نەپچراو لەو کەسانەی کەفەرموودەکەیان گیراوەتەوە گەیشتووە ئەم جۆرەش پی دەلین : ( المسند ) بۆنموونە کە ( المسندی ) ئیمام ( احمدی کوری حەنبەل ) نزیکەی ٣٠٠٠٠هەزار فەرموودەی تیدایە بە دووبارەوە ئەمەش لە سالی ٢٠٠ کۆچی دا ئەم ( المسندی ) دەر کردوە ، بەلی ئەم فەرموودانەی یان ئەم نووسینانەی کە لەسەردەمی قۆناغی چوەرم دا هەبوو هەر هەموویان صحیح بوون متصل بوونە ......!!

قۆناغی پینچەم : لە سالی ٢٠٠ کۆچی دا دەست پی دەکات ، وە بە قۆنایکی پەرشنگدرا دیدەنریت ، چونکە لەم سەردەمەدا کۆمەلیك زاناو شارەزا لە قورئانی پیرۆز فەرموودەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەر کەوتوون بۆ خزمەت کردنی ئاینی ئیسلام ، ئەوانیش هەستا بە کۆمەلیك مەرجی لەسەر فەرمووده کانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ ئەو کەسانەی کە فەرمووده کەیان لی وەرگرتووەیان فەرموودەیان گیراونەتەوە ، چەند ریسا یاسا یەکیان دان بۆ ئەو کەسانەی کە فەرموودەکەیان لە پیش خۆ وەرگرتووە ، وەك ئیمامی ( بوخاری ) کە ناوی ( محمدی کوری اسماعیل بوخاریە ) لە کتابی ( جامع المسند صحيح مختصر ) بەلی قۆناغی پینچەم قۆناغی سەردەمی ئیمامی بوخاریە کە ئەو زانا یە بەناوبانگە زۆر بەی زانایانی فەرموودە ناس ئەلین لە دوای قورئانی پیرۆز کاتبی صحیح بوخاریە ،کە ناوی ( جامع المسند الصحیح مختصر ) کە لە سالی ١٩٤ کۆچی لە دایك بووە ، لە سالی ٢٥٦ کۆچی وەفاتی کردووە ، ئەگەر دوا بەدوی شیخەکان و قوتابیە کانەوە بچین نموونەیەك وەربگرین کە لە یەکەم کەسەوە دەست پی بکەین دەبینین زۆر جوان بۆ مان روون دەبیتەوە کە ئەمانەی خوارەوە زنجیرەی شیخ و قوتابیە کانن :

١- ئیمامي الترمذي قوتابي – ئیمامي مسلم بووە ، ٢-وە ئیمامي مسلم قوتابي ٣- ئیمامي بوخاریە بووە ، وە ئیمامي بوخاري قوتابي -٤-ئیمامي احمد بووە ، وە ئمامي احمد قوتابي ٥-ئیمامي شافعي بووە ، وە ئیمامي شافعي قوتابي ٦-ئیمامي مالیك بووە ، وە ئیمامي مالیك قوتابي ٧-ئیمامي نافع بووە ، وە ئیمامي نافع قوتابي ٨- ئیمامي أعره ج بووە ، وە ئیمامي أعره ج قوتابي ٩-ئیمامي ابو هريرة بووە ، وە ابو هريرة قوتابي – پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بووە ، بەلی لە قۆناغی پینچەم دا کاتبی ( صحیح مسلم ) سنن ابی داود ، هەروەها سنن الترمذي ، ابن ماجە و ە ئیمامي النسائي سنن دارمي وە دەیان زانای تریش کتابیان هەبووە هەر بۆیە قوناغیکی پرشنگدرا دادەنریت ، لە سەردەمی ئیمامی بوخاری وە دەست پی تاکو نزیکەی سالی ٣٠٠ کۆچی دا ئەم سەردەمەش بە سەردمیکی زیرین دادەنریت بۆ نووسینەوەی فەرمووده کانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) وە پۆلین کردنیا لە روی گیرانەوە کانی هاوەلان و تابعین و تابیعی تابیعن و شوینکەوتوانیان ،بەلی بەم جۆرە فەرموودە کانی پیغەمبەری خوا گەیشتۆتە بەردەستی ئیمە بۆ شارە زابوون لە ئاینی ئیسلام شریعەتەکەی خوا پیغەمبەرە کەی ( صلى الله عليه وسلم ) ...!!

## ﴿ کەی فەرمووده هەلبەستین یان ( الحديث الموضوع ) دەستی پی کرد وه هۆکارەکەی چی بوو ﴾

بەلی ئەگەر بگەرینەوه دوای وەفاتی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم )وه سەردەمی خلیفه کانی راشدین ،که له سەردمی فتنەی موسلمان که لەسەردمی خلیفەی موسلماندا ( على کوری ابي طالب ) و ( معاويه کوري سفيان ) كه لەسالی ٤٠ کۆچی دا جیاکەرووەیەك دەستی پیکرد بووه هۆی فنتەو ئاژاوه نانەوه لەنیوان موسلمانان ، بی گومان هەوالانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بەدلنیا یەوه دوای بیستنی ئەم فەرموودەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) كه له له فەرموودەکەی ( ابو سعیدی خدری ) –خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : (( لا تكتبوا عني ،ومن كتب عني غير القران فليمحه وحدثوا عني ،ولا حرج ، ومن كذب علي – قال همام : أحسبه قال : متعمدا – فليتبوا مقعده من النار )) (١) واته : هیچ شتیك له منەوه مه نووسنەوه ،هەر كەسيك شتيك بنووسيت له منەوه جگه له قورئانی پیرۆز، ئەوا با بیسریتەوه ، قسەی من بگرینەوه قەیناکه هەرکەسیکیش به زمانی منەوه درۆ بکات ، همام ئەلی : وابزانم فەرمووی : به ئەنقەست ، ئەوا باشوینی خۆی له دۆزەخ دا ئاماده بکات .بەلی دوای ئەم فەرموودەیه بەهیچ جۆریك درۆیان به دەمی پیغەمبەری خواوه ( صلى الله عليه وسلم ) نەده کرد ، بەلام ئەوەی بووه هۆی فەرموودەی هەلبەستن یان ( الحديث الموضوع ) ئەوه له سالی ٤٠ کۆچی دا بووه ئەم ش به هۆی ئەم فتنەیەی یان ئەم ئاژاوەی لەنیوان برایانی موسلمانان دا بووه ، بی گومان هەموو سەردەمیك ناحەزانی ئیسلام دوژمنانی ئەم ئاینه له برسه دا بووینه به لیدان شته جوانەکانی ئیسلام وەك ئەم سەردمه ئیستا ئیلحاد و علمانیه له بۆسه دان بۆ لیدان له شتەجوانەکانی ئیسلام و بەژەوەندی موسلمانان دژیاتی کردنیان به تایبەتیش موناقفانی ئیسلام که له ژیروه موناڤق دوو روو وەك مار ژەهرەکەیان بەسەر ئەم ئیسلام جوانه دا دەرژین ، چاویان به م ئاینه پاك و بیگەردن هەلنایەت ، هەر بۆیه لەسەردەمی خلیفەی موسلمانان و معاويه ی کوری سفيان –خوا لی یان رازی بیت - فەرموود هەلبەست لەویدا سەری هەلدا ، ئەوەش به هۆی ئەوی که ئەو فتنەیه لەنیوان موسلمانان دا بەر پا بوو ، که دوژمنانی ئیسلام موناڤیقه کان ئاگری شەرەکەیان گەرم دەکرد به فەرموودەی هەلبه ستراوه بەناوی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەمەش بۆ مەرامی دەسەلات فەرمانرەوای خۆیان کەله بەرژەوەندی خۆیان دا بو ئاگری فیتنەکه خۆش بکەن ، بەلی هەر ئەم سەردەمدا خواریجەکان پەیدا بوون ، که دژی هەردوو کیان بوون ، واته خلیفەی موسلمانان على وه معاويه ی کوری سفيان ، بەلی ئەم بووه هۆی دابەش بوونی موسلمانان ، بی گومان هەر دەستیه ك دەی ویست هەلویستی خۆی زال بکات بەسەر دەسته کەی تردا ئەویش به بەلگەی قورئان فەرموود کانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لەم نیوانەدا موناڤیق دوژمنانی ئیسلام ئەو دووبەرەکەیه یان بەهەل زانی ، کەوتنه لیکدانەوه و تەویل تفسير کردنی قورئانی پیرۆز فەرمووده کانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ مەرامی سیاسی خۆیان وئاگری فتنەکەیان زۆر تر دەکرد ، وەهەروەها هەندیکی تریشیان کەوتنه هەلبەستنی فەرمووده بەده پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ ئەوەی فەرموودەیەکی هەلبستراو هەلببەستن بۆ ئەوەی پشتگیری بەرەکەی تر ی بی بکەن ،هەلبه تەنەیان توانی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز زیاد بکه چونکه خوای گەوره پەیمانی داوه قورئانی پیرۆز بپاریزریت له هەموو خرا په کاریەك دا.........................................................................؟!!!

---

١–رواه مسلم ٣٠٠٤ .

بەلی یەکەم جار فەرموودەی هەلبەستراو، دەربارەی ئەو کەسانە بوو فەزل و گەورەیی یان هەبووە یان ئەوتا پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەفەرموودە کانی فەزل و گەورەیی داوەتە بە هاوەلانی دا لە رووی نیاز پاکی دلسۆزی و خزمەت کردنی ئەم ئاینە پیرۆزە وە ،یان فەزل و گەورەیی هۆزو تیرەکان ، یان فەرماندەکانی سوپای ئیسلام ،دە گیرنەوە دەلین : کە شیعەکان دەست پیشخەریان کردووە بەجیاوازی دەستەو مەزهەبەوە ، وەك چۆن : (ابن ابی الحدید) دەلی: ((بزانە بنەرەتی درۆ لەو فەرموودانەدا باسی چاکەی کە سەکان دەکات لە شیعەوە هاتووە ...)) (١) بەلی ئاسان نیە وینەی ئەوە بکەین کەبلین : لە سەردەمی هاوەلان دا هەلبەستنی فەرموودە سەری هەلداوە ، چۆنکە هاوەلانی پیغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم) سەر و مال سامان مندالانی خۆیان کردۆتە خزمەت پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەروەك ریوایەت کراوە ئەگیرنەوە دەلین : (عمری کوری ختاب) – خوا لی رازی بیت – ووتاری بۆ خەلکی دەدا ، ئەویش دەی فەرموو: لە مارەیی ئافرەتاندا زیادە رەوی مەکەن، چونکە گەر مارەیی زۆر ریزیك بوایە لەلای خوداوە نزیکترین کە پیی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دە بوو ، ژنیکی لە ناو کۆمەلە کە هەستاوەو لەبەر چاوی خەلکی دا لی راست دەبیتەوە و دەلیت : بووە ستە ئی (عمر) خودای گەورە دەفەرموویت : ﴿وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَارًا﴾النساء ٢٠ . واتە : مارەیە کەی ئالتوون سامانیکی زۆرتان پیدا بوو . هەروەها (عمری) دەفەرموویت : ژنیك راستی کرد پیاویك هەلەی کرد (٢). بەلی ئەم نموونەیە ئەم شیرە پیاوانەبوون کە هاوەلی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوونە هەر گیز درۆیان بە دەم پیغەمبەرکەی دا نەکردووە بەلکو لەشوینك هەلەبوونایە ئەیان ووت هەلەین ، هەروەك لە ریوایەتیکی (البراء) – خوا لی رازی بیت – دا هاتووە دەفەرموویت : (( ئیمە هەموومان فەرموودەی پیغەمبەری خودامان (صلى الله عليه وسلم) نەدەبیست ، چونکە هەندیکمان خەریکی مال مندال مان بووین هەندیکی تریش لەبەردەوام لەخەزمەت پیغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) دا بوون ،بەلام خەلکی درۆیان نەدەکرد ، هەر بۆیە ئەوەی ئامادە دەبوو فەرموودەکەی دە گیرایەوە بۆ ئەوانەی لەوی ئامادە نەبوون (٣) . ئەگەر بگەرینەوە سەردەمی تابعین بی گومان هەلبەستنی فەرموودە کەمتر بووە وەك لەوەی لەدوای خۆیان تابعی تابعین دین ،چونکە ئەوان پەروەردەی دەستی هاوەلانی پیغەمبەری خوا بوونە ، زیاتر دیندار ترو لە خوا ترستر بوون ، لەو نەوەی دوای خۆیان ، بی گومان ئەوانیش خزمەتیکی زۆریان بە م ئاینە گەیاندووە زانیا چاکیان تیدا هەلکەوتووە ، بەلام بەهۆی ململانی سیاسەتی فەرمانرەوایی ئەم سەردەم کۆمەلیك لە مونافیق و خواریج زندیقەکان ،هۆزو رەگە و زمان و ولات دەسەلات فەرمانرەوایی خەلیفە کانی ئومەوی یان خەلیفە کانی عباسی ، بی گومان ئەمانە هۆکاری زرۆ بوون بۆ ئەوەی فەرموودەی هە لبەستراو بەدەم پیغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) دروست بکەن بۆ مەرامی سیاسی و ئارەزووی خۆشی دونیان فەرمانرەوایەتی خۆیان یان بە هۆی جیاوازی فقهە ی مەزهەبی وکلامی یان خۆنزیکردنەوە لە سولتانەکان ئەمیرە کان ، ئەکینا فەرموودەی هەلبەستراو بوونی نیە ، ئیستا ئەگەر بگەرینەوە سەندی فەرموودە بۆمان زۆر بەجوانی روون دەبیتەوە بەلام فەرموودەی لاوازە هەن ئەمەش هۆی لاوازی گیرانەوەکان.

---

١-شرح نهج البلاغ

٢-اخرجە : الامام احمد فی مسندە .

٣-اخرجە : البیهقی .

## ﴿مەرجی زانایانی ئیسلام بۆ بەرنگاری بوونەوەی فەرموودەی هەلبەستراو یان ( الحدیث الموضوع ﴾

بی گومان زانایانی ئاینی ئیسلام زانایانی فەرموودە ناس هەولی زۆریان داوە بۆ ئەوەی فەرموودەی صحیح له فەرموودەی الموضوع یان هەلبەستراو جیا بکەنەوە ، ئەو ش بە هیز و توانا تی کۆشانی زۆر بیرهزری هۆشمەندی زانایانی فەرموودەناس ئەم هەولەیانداوە تاکو فەرموودەی هەلبەستراوە تیکەل بە شەریعەتی ئاینی ئیسلام نەکریت ، بەلی هەول وکۆششە زۆر ورد یان کردووە لە پیناوی فەرموودەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ جیا کردنەوەی فەرموودەی دروست یان نا دروست ، ئەم ئیجتهاد تی کۆشانەیان لە پیناوی خوا پیغەمبەرەکەی دا ( صلی الله علیه وسلم ) کردووە ، بەلی ئەم تی کۆشانەش نموونەی نیە کە ئەوریگایەیان گرتۆتەبەر ،وە راسترین ریگای زانستیە لە فەرموودە ناسی ، زانایانی ئومەتی ئیسلام –خوا لی یان رازی بیت- یەکەمین دەستە بوون کە لە نیوان هەموو ئومەتانی سەر زەویدا ریسای رەخنەی زانستی وردیان بۆ هەوال ریووایەت داناوە. بەلی ئەوهەنگاوانەیان ناوە لە پیاناوی پاراستنی سوونەت یان فەرموودە کانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە پیلانەانەی دوژمنانی ئیسلام رزگاریان کردووە ، ئەویش ئەم مەرجانەی خوارەوەیە :

**یەکەم : سەندی فەرموودە واتە : ( زنجیرەی ئەو کەسانەی کە فەرموودە کە دەگیرنەوە )**

بەلی لەدوای وەفاتی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وە فاتی هاوەلانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هیچ گومانیەان بە یەکتری نەبووە بەلکو لەدوای تابیعینی شەوە لەوەرگتنی فەرموودەدا کە هاوەلانی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەیان گیرایەوە هیچ وەستانیان نەبوو ، تاکو فیتنەی نیوان موسلمانان سەری هەلدا ، ئەوە بوو پیاویکی جوولەکە یان زیانۆمەند یان ( عبدالله ی کوری سبا ) ی جوولە کەی مونافیق هەستا بە بانگەوازی کردن درۆ کردنە پر لە تاوانەکەی خۆی بیرۆکەی زیادەرەوی لەشیعەگەری دا دانا بە دانانی خوایە تی ( علی کوری ابی تالیب ) ولعیاذ بالله ، لە م سەردەمەوە دەست خستنە ناو فەرموودەکانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) زیادی کرد سەدە لەدوای سەدە دا ،لیرەوە فەرموود ناسە کان زانایانی ئاینی ئیسلام شوینکەو توان واتە : تابعین تابعی تابعین کەوتنەوە گواستنەوەی فەرموود کانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بەلام بە مەرج و یاسا ریسا قبولی یان نەدە کرد تاکو ریگەکەی راوییە کانیان نە ناسیبایەوە دلینابوونایەتەوە لە متمانە پی کردنیان صحیحی فەرموودە کان واتە عەدالەتی فەرموودە . هەروەك ئیمامی مسلم لە پیشەکیەکەی دا بۆ مان دەگیریتەوە ئەویش لە ابن سیرینەوە دەگیریتەوە دەلیت : ئەوان واتە : هاوەلان شوینکەوتوان پرسیاری سەنەدی فەرموودەیان نەدەکرد تاکو فیتنەی هاوەلان دروست نەبوو یان روویدا ، ئەو کاتە ووتیان ناوی پیاوانتان بهینن تەماشای ئەهلی فەرموودە دەکرا فەرموود کەیان وەردەگیرا ، تەماشای ئەهلی بدعە دەکرا فەرموودە کەیان رەت دەکرایەوە .(١)

---

١- رواە مسلم : فی مقدمەصحیح مسلم

دووەم : متمانە كردن یان ( التوثیق )

ئەوە ش بە گەرانەوە بۆ لای هاوەلانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) تابعین تابیعی تابعین واتە شوینکەوتووی شوینکەوتوان ، یان گەرانەوە بۆ پیشەوایانی فەرموود ناسی ، ئەوە بوو خوا گەورە كۆمەلیك یان دەستەیەك لە هاوەلانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دریژ كرد بۆ ئەوەی تابعین بە سەندیكی راست و دروستەوە فەرموودەكانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) وە ربگرن ئەو ش بووە بە مەرجەعیەتیك بۆ پیشەوایانی فەرموودە ناسان ، بەلی كاتی درۆ هاتە ئارایەوە لەسەردەمی فیتنە دا ، خەلكی پەنایان بردە بە هاوەلانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) چونكە جیگای متمانە بوون یان جیگای ( التوثیق ) بوون ، بەلی خەلكی پرسیاریان دەكرد دەبارەی فەرموودە كان لە هاوەلانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) پاشان پرسیاری ریوایەت سەندیان لەدەكرد یان ئە ئاسارانەی كە لەدەمی خەلكەوە دەیان بیست ، هەروەها ( سعدی كوری موسەیب ) دەلیت : ( چەندین رۆژ و شەو بە دوای یەك فەرموودە دا دەرۆیشتم ).

سی یەم : بارودۆخی راویە كان یان روشنكردنەوەی حالیان لە رووی راستگۆیی و درۆكردن

بەلی ئەم ش هەنگاویكی زۆر مەزنە كە زانایان فەرموودە ناس ئەم خالەیان دانەوە كە بارودۆخی راوی یان روشنكردنەوەی حالیان چۆونە یان رەوشت بیرو فكرو زیرەكی حالی راویەكان چۆن بووە ، بی گومان راوی بە مانای ئەوە ی كە ئەو كەسەی فەرموودەكەی گیراوەتەوە لە كەسكی پیش خۆی وەر گرتووە ، ئەمەش بارودۆخی راویە كە هەلدە سەنگینین تا چەند جیگای متمانە پی كردنە ،بەم هۆیەوە دروست و راستی فەرموودەكە لە هەلبەستراو یان درۆ كردن جیا دەكریتەوە ، یان ئەوە بەهیزی فەرموودە كە لە رووی راست و دروستیەوە یان لە رووی لاوازی دیار دەكات ،بەلی زۆر گرینگە لە حالی راویە كان بكۆلینەوە لە سەردمەكەیان لەشوینی و پیشەو رەوشتی راویە كان كە فەرموودە كەیان گیراوە تەوە ، هەروەها لە تەمەنی راوی ، بەلی بە كورتی لی كۆلینەوە لەژیانی راوی دە كریت لە هەموو ریەكەوە ئینجا فەرموودەی لی وەردەگیریت هەروەك : بە ( یەحیای كوری قەتانیان ) ووت : ئایا تۆ ناترسیت ئەوانەی فەرموودەیان لی وەرناگری لە رۆژی دواییدا لەلای ( خوای گەورە ) دا بن بە نەیارت ..؟! ئەویش ووتی : ئەگەر ئەوان نەیارم بن پیم خۆشترە لەوەی تا پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم )نەیارم بیت وە پیم بفەرموویت : بۆ ریگریت نەكرد لە دۆر كردن بەرانبەر بە فەرموودەكانم ...؟!

# گرنگترین ئەو کەسانەی کە فەرمووده یان لی وەرناگیریت

١-درۆزن بەدەم پیغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) جمهوری زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوە درۆزن بەدەم پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموودەیان لی وەرناگریت ، هەر بەم جۆرەش کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەو کارە گەورەترین تاوانە ،وە کۆمەلیك لە زانیان بە کوفر یان داناوە ..!! هەروەهاجیاوازی هەیە لەرووی تۆبە کردنەکەی ..؟ وە ك: ( ابو بكر حميدى ) کەماموستای ئیمامی بوخاریە دەلیت : هەرگیز تۆبەی قبول نابیت ..!! بەلام( ئیمامی نەوەوی ) ئەلیت : تۆبەی قبولە بەلام ریوایەت و شاهیدی لی وەرناگیریت ، حالی ئەو کەسە وەك حالی کافریك وایە تازە موسلمان ببیت ..!! بەلام (المظفر السمعاني ) دە لیت :هەر کەس لەیەك هەوالدا درۆ کرد هەموو ریوایە تەکانی پیشووی بەردبنەوە لی وەرناگیریت .

٢-درۆزن لە قسە ی گشتیدا کردبیت یا درۆشیان بەدەم پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەکردبیت یان هەلنەبستبیت ، بەلکو درۆی کردبیت لە ناو خەلك دا ، واتە : هەرکەسیك یەکجار درۆ لی بینراوبیت ئەوا فەرموودەی لی وە نارگیریت ..!!

٣-ئەو کەسانەی خاوەنی بیدعە و ئارەزوون :واتا لە خۆیەوە شت زیاد بکات لە ئایندا بە ئارەزووی خۆی حەلال حەرام بکات حەرام حەلال بیکات ، یان ئەوتا شتیك بوونی نیە یان فەرمانیك بوونیە لە دین ئەو بۆی زیاد بکات ، یان واجب کەم بکاتەوە بە ئارەزووی خۆی ،بەلی ئەم جۆرە کەسانە فەرموودەیان لی وەرناگیریت ، وەك تەصوفی ئیستا کە بیدعە دەکان بەناوی پیغەمبەی خوا (صلى الله عليه وسلم) مولودی پیغەمبەریخوا (صلى الله عليه وسلم) کردوویانەبەچەژن زیاد لەدین یان چەندین بدعەتر بەناویشیخەکانیان سەردانی گۆری شیخەکانی تەصوف و سۆفی گەری ، بی گومان ئەو بیدعانەی کەدە کەن بەشیکیان دەچنە خانەی کوفر ،کە تاوانیکی یەکجار گەورەیە ،بەلی بیگومان ئەهلی بیدعە فەرموودەیان لی وەرناگیرت ..!!

٤-زەندیقەکان و فاسیقان و دوو رووە کان ، کە نازانن چی دە گیرنەوە ، بەهەمان شیوە هەموو ئەو مەرجانەی کەباسمان کرد لە م کۆمەلەدا هەن ، کەسانی بی متمانە و درۆزن خاوەنی ئارەزووی خۆیانن ، هیچ تیگەیشتنیان تیدا نیە ، هەروەك (ابن كثير) – رەحمەتی خوای لی بیت = دەلی : (قبول کراو بریتیە لە : متمانەداری دەرخکەر بۆ ئەوەی دەیگیریتەوە ، ئەو کە سەش لە هۆکارە کانی فیشق و رووخانی جوامیری و پیاوەتی کەسیکی موسلمانی ئاقی بالغی تەندورست بیت ، هەروەها کەسیکی بە ئاگا بیت و گەمژە نەبیت ، دەرخکە بیت بۆ ئەو شتەی دەرخی کردووە و تیگەیشتوو بیت ، کاتیك قەس لەمانا دەکات ،گەر یەکیك لەم مەرجە ناتەواوانەی تیکەوت ئەوا ریوایەتەکەی لی وەرناگیریت و رەت دەکریتەوە ..؟! ). (١)

---

١-ابن كثير إختصار علوم الحديث .

## ﴿مەرجی وەستان یان ( موقوف ) وەرگرتنی فەرمووده لە راویە کان﴾

١-هەرکەسکی جیاوازی هەیە لەسەر لە کەدارەکەی و راستکردنەوەکەی ( تجریح تعدیل ).

٢-هەر کەسی هەلەی زۆری هەبیت سەرپیچی ئیمامە خاوەن متمانەکەی بکات لە ریوایەتەکانیدا .

٣-هەرکەسی لە بیر چوونەوەی زۆر بیت ، واتە : شتی زوو لەبیر بچیتەوە .

٤-هەرکەسی لە کۆتایی تەمەنی دا تیکەلی کردبی یان بەهۆی تەمەنیەوە فەرموودەی بەتەواوەتی و دروستی لەبیر نەمابیت .

٥- هەرکەسی لە بەر کردن یان دەرخکردنی خراپ بیت توانای زۆری نەبیت لە درخکردندا .

٦-هەرکەسی لە متمانەدان بەلاوازی فەرموودە وەرگریت ، بە ریك و پیکی بەدوای فەرموودە کە نەکەوت بیت لەوەرگرتنی .

## ﴿ دابەش کردنی فەرموود بۆ سی بەشی سەرەکی ( صحیح ) ، ( حسن ) ، ( ضعیف ﴾

# یەکەم: فەرموودەی ( صحیح ) :

پیناسەی: فەرموودەی ( صحیح ) لەرووی زمانەوانی دا بەمانای ساغ دیت واتەدژی نەخۆش یان ( السقیم ) یان بی کەم وکوری ئەم راستەیە بۆ لاشەی مرۆڤ بەکاردیت بەشیوەیەکی مانای ( مجاز ) بۆ فەرموود بەکار دیت .

وەلەرووی زاراوەوە ، ئەوەی کە ( سەندەکەی ) پەیویست بیت ، بەوەی ك کەسکی راستگۆ ( عادل ) گیرانەوە کەی بی کەم کوری بیت لە ( ضبط ) لە کەسکی تری وەك خۆی وەری گرت بیت تا کۆتایی سەندە کە بەبی بوونی ( شاذ ) ، ( علة ) بوون تیدا .

مەرجەکانی فەرموودەی ( صیحیح ) ئەگەر ئەم پینج مەرجەی تیدا نەبیت بە صحیح وەرناگیریت .

١-اتصال السند ، واتە: مەبەست ئەوەیە کە هەر یەکیك لەو کەسانە یان لەو راویەك لەو راویانە لە سەندی گیرانەوەی فەرموودەکەیدا ناویان هاتووە ، دەبیت بە یەکیك لەو ریگایانەوە وەری گرت بیت بە بی پچراند تا کۆتایی راویە کە تا دەگاتە پیغەمبەری خوا ( صلى الله علیه وسلم ) واتە: یەك لەدوای یەك فەرموودە کەیان گیراوەتەوە بە بی پچران ، ئەوەش پیچەوانەی فەرموودەی منقطع ، کەواتە بە صحیح وەردە گریت .

٢-راست گۆیی لە گیرانەوەی فەرموودە کە ( عدالە الرواە ) وتە :کەسەکە یان راویە کە بە کەسکیکی متمانە پیکراو موسلمان و عاقل بالغ و چاکەکار بیت ( غیرفاسق ) بیت .

٣-بیر تیژبیت بەهیز بیت لە گیرانەوەکەیدا واتە: ( ضبط الرواة ) هەموو راوی یانەدە بیت ( تام ضبط ) بیت ئیتر هەرچی لە بەری کردووە لەبری نەچیت بیر تیژ بیت فەرموودە کەی لەسینگی دا بیت دەرخی کردبیت زۆر بەباشی ، هەروەك چۆن فەرموودە کەی بیتسووە لە مامۆستاکەی ئەوەا فەرموود کە بۆ کەسانی تر بگیریتەوە .

٤-ناوازە نەبیت لە ( متن ) فەرمووردە کە واتە : ( شاذ ) نەبیت واتە: ( عدم شذوذ ) کە پیچەوانە نبیت لە گە ل کەسیکی تر کە لەو بەمتمانەتر ( الثقة ) ، واتە : ئەو کەسەی فەرموود کە دەگیریتەوە نابیت پیچەوانەی چەند کەسیکی تربیت الثقات بیت .

٥-فەرموودە کە سەلامەت بیت لە هۆیەك کە لەکەداری بکات ،یان عیللە بوون ، ( عدم العلة ) وە یان نابیت فەرموود ك ( معلول ) بیت یان بە هۆکاریك ( غامض ) بیت یان ( خفي ) یان شاراوە بن ، دەبیت وەك رووکەش سەلامەتی فەرموودە کە لی چاوەری بکری.

جا هەرکاتیك مەرجیك لەو مەرجانەی تیدا بوو وەك :( اتصال السند – عدالة الرواة-ضبط الرواة – عدم العلة – عدم شذوذ )

جا هەرکاتیك مەرجیك لەو مەرجانە نەبوو ئەوا فەرموودە کە بە( صحیح ) وەر ناگری یان بە صحیح دانانری .............؟!

بۆ نموونه : بوخاری له كتابه كەی دا هیناویه تەوه واته (صحیح بخاری ) دەلیت :(حدثنا عبد الله بن یوسف قال اخبرنا مالك عن ابن شهاب عن محمد بن جبیر بن مطعم عن ابیه قال : سمعت رسول الله (صلی الله علیه وسلم ) قرأ في المغرب بالطور)(١) واته : نویژی مغرب دا سورەتی طوري خویندەوه .

١-سەندی راست و دروسته و پویسته : چونكه هەموو راویەك لەو راویه تری وەرگرتووه كه له مامۆستاكەی بیستویەتی ، وەك دەلی (عن ) یان (عنعنه ) بەمانای ئەوه دی گیرانەوه كەی فەرمووده كه له مامۆستاوه بەله فزی (عن ) دیت ، هەروەها بوونی (مالیك ) و (ابن شهاب ) و(ابن جبیر ) ئەوه لەسەری پیویست بوون (الاتصال ) حیساب دەركری ، چۆنكه ئەوان درۆزن یان (مدلس ) نین .

٢-چونكه راویه كان یان كەسەكان راست و (عادل) وه بیرتیژ ریك پیك (ضبط) یان هه یه .

كەسەكانی ناو گیرانەویه كه یان راویه كانی :

١-(عبدالله بن یوسف ) به متمانەو ورد بینه (ثقة و متقن )

٢-مالك ابن انس ) إمام حافظ زۆر ترین فەرموودەی له بەركر كردووه یان دەرخی كردووه .

٣-(ابن شهاب الزهری ) فقیه ،حافظ ، متفق علی جلالته واتقانه ، فەرموودی زۆری لەبەره شەریعەت زانه ورد بینه .

٤-(محمد بن جبیر ) خاوەنی متمانەیه (ثقة ).

٥-(جبیر بن مطعم ) ئەو كەسە هاوەلی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) جیگای متمانەیه .

بەلی ئەم فەرموودەیەهیچ كەم كوریەكی نیه هیچ واته پیچەوانەی مەرجەكانی قبول بوونی فەرموودەی صحیح تیدانەی هەربۆیه ئەم فەرموودەیه به صحیح هەژمار دەكریت و له یەكیكه له فەرموده صحیحەكان كاری پی دەكریت له رووی فقه وشریعەتەوه ، چونكه هەموو مەرجەكانی صحیح بوونی تیدا بەدی دەكریت ، هەربۆیه كتابی صیحیح بوخاری هەموو فەرموود كان بەم جۆره هیناویەتەوه لەدوای قورئانی پیرۆز له رووی فقه شرعەوه كاری پیدەكریت بۆ خیلاف یان راو بۆچوونی موسلمانان لەسەر هەرشتیك كه دەگەرینەوه بۆ فەرموده كانی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) لەدوای قورئانی پیرۆز ، ئەویش صحیح ی بوخاریه كه هەموو مەرجیكی صحیح فەرموودەی تیدایه كه ئەم زانه بەریزه بۆ مانی هیناوەتەوه –خوا لی رازی بیت - ...؟!

---

١-صحیح البخاری .

# ﴿ جۆره كانی فەرموودەی صحیح ﴾

## یەكەم : صحیح لذاتە

ئەوفەرموودانە كە لە سەروە دا پیناسە كراوە :

ئەم جۆرە فەرموود نموونەی زۆرە ، لەوانە ئەو فەرموونەی كە هەردوو ئیمامەكە واتە : ئیمای بوخاری و ئیمامی مسلم ، فەرموودەكەیان گیراوەتەوە ، واتە : پییان دەووتریت (متفق علیە )

وەك ئەم فەرموودیەی كە (سفیانی كوری عوینییە ) لە (عمرەوە) ئەویش لە (ابو هریرە ) ئەویش لە پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) دەفەرموویت : (( الحرب خدعة )) واتە : جەنگ هەلخەتاندنە . صحیحین: البخاری ومسلم .(١) (٢) .

بەلی بۆیە بەم ناوەوە هاتوو صحیحین یان (متفق علیە ) ناونراوە ،چونكە گیرانەوەكەی یان (المحدث ) هەردوو كیان ئەم فەرموودەیان گیراوەتەوە كە بوخاری مسلم ، هیچ پیویست ناكات بگەرین یان بە شوین ریگەیەكی تر دا بگەرین تاكوو فەرموودە بەهیز بیت ، خۆی لە خۆدا پیویست ناكات چونكە فەرموودە بەهیزە هەردوو گیرانەوە كە یان (المحدث ) مەرجی تەواوی فەرموودە كەیان داناوە بە وە بەصحیح داینا ناوە ، هەربۆیە ئەم جۆرە پی دەووتریت (صحیح لذاتە ) یان متفق علیە یان صحیحین .

---

١-صحیح البخاري كتاب الجهاد والسیر، باب الحرب خدعة برقم (٢٨٦٦).

٢-صحیح مسلم كتاب الجهاد والسیر ، باب جواز الخداع في الحرب برقم (٤٦٣٧ ) .

## دووم : صحيح لغيره

ئەم فەرموودەيە خۆی لە خۆی دا فەرموودەی حسن بەلام زانايانی فەرموودە ناس وا پيناسە يان كردوو، كە ئەم فەرموود خۆی لە خۆی دا لە چەند ريگەيەوە گيراونەتەوە ، ئيتر هەر هەموو ريگايە كان وە كوو يەكن ياخود هەنديكيان لە هەنديكيان بەهيز ترن ،ئەم جۆرە فەرموودەيە بۆ يە بەم ناوە ناونراوە (صحيح لغيره )چونكە ئە گەر تەماشای بكەين ، لە هيچ كام لەوە ريگايانەوە كە گيراويانەتەوە نەگەيشتۆتە پلە (صيحيح ) بۆيە پی دە ووتريت (صيحيح لغيره ) بەلام هەر هەموو ريگايەكان بەهيزن تاكو گەيشتۆتە پلەی صيحيح لغيره ) كەواتە بە هۆی بە هيزی گيرانەوە كان بە (صحيح ) دادەنريت ، ئەگينا صحيح نيە بەلكو وەك فەرموودەی (حسن ) وايە .

نموونەی ئەم جۆرە فەرموودە كە لە ريگەی (محمد كوری عمری كوری علقەمە ) ئەويش لە(ابو سەلەمەوە ) ئەويش لە (ابو هريرە)وە ئەويش لە پيغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموويت : (( لولا أن شق أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة )) . (١) .

هەر بۆيە (ابن صلاح شارەزوری ) دەليت : (محمدی كوری عمری كوری علقەمە ) خۆی بەراستگۆيی بە ناو بانگە، كە فەرموودەكە لە (ابو سلمەوە ) وەرگرتووە ئەويش لە (ابو هريرە )وە ، بەلام لە رووی وەرگرتن و ريخستنەوە لاواز بووە ، بۆ هەنديك لە زانايان بە صيحيح تەواويان دانەناوە هەر بۆيە بەم جۆرە فەرموودانە دە ووتريت : (صحيح لغيره ) ، بەلام هەنديك لەفەرموودە ناسان بە پياويكی متمانەيان داناوە هەر بۆيە بە صحيح دانراوە ، چونكە پياويكی راست گۆ بووە ، بەلام لەبەر ئەمەی كە ئەم فەرموودە لە ريگەيەكی ترەوە گيردراوەتەوە ، ئتر بە هيز نيە وەك صحيح ی تەواو يان ، چونكە ووتراوە ئەم پياوە محمدی كوری عمری كوری عقلەمە ، بەهيز نەبووە بۆ لەبەر كردنی فەرموودە بەلام پياويكی راست گۆ و بە متمانەبووە ، هە بۆيەش ئەم جۆرە فەرموودە بە(صحيح لغيره ) دانراوە . (٢)

---

١-سنن الترمذي باب الطهارة (السواك ) برقم (٢٢ ) .

٢-كتاب مقدمة ابن صلاح ص ٢٠ .

# ﴿پلەكانی فەرموودەی صحیح﴾

١-ئەوفەرموودە صیحىحانەی کە هەردوو ئیمامی بوخاری و ئیمامی مسلم گیراویانە تەوە ،لە زاراوەی فەرموودە ناسی پی دەووتریت ( متفق علیە ) .

٢-ئەوەی تەنها بوخاری گیراویەتەوە ،واتە : ( رواه البخاری )

٣-ئەوەی تەنها مسلم گیراویەتەوە واتە : ( رواه مسلم )

٤-ئەوەی کە لەسەر مەرجی یان ( شروط ) ی هەر دووکیانە بە لام ئەوان نەیاگیراوە تەوە .

٥-ئەوەی تەنها لەسەر مەرجی یان ( شروط )ی بوخاریە ، بەلام ئەو نەی گیراوەتەوە .

٦-ئەوەی تەنها لەسەر مەرجی یان ( شروط ) مسلم ،بەلام ئەو نەگیراوەتەوە .

٧- ئەوەی بەلای زانایانی تروە بە ( صحیح )دانراوە بەلام لەسەر مەرجی یان ( شروط ) ی بوخاري مسلم نیە ، بۆ نموونە : وەك زانایانی فەرموودە ناس ( ابن خوزیمە ) و ( ابن حبان ) ( ئیمامی حاكم )...هتد

## ﴿ئەو كتابانەی لە دوو كتابە صحيحە كە دەرهێنراون یان ( المستخرجات على الصحيحين ﴾

أ-ئەوە یە كە نووسەری كتێبێك لە كتێبە كانی فەرموودە بهێنێت و جا فەرموودە كانی ( تخرج ) بكات بە سەندی كی زۆر هی خۆی بن لە سەر غێری رێبازی خاوەن كتێبە كە ، جا ئەوەی لە شێخەكەی یان لەسەرووی ئەوە وە بە یەك بگەنەوە .

ب- بەناو بانگ ترین ( مستخرجات ) لە سەر دوو كتێبە صحيحيە كە :

١-( المستخرج ) دانراوی ( ابی بكر اسماعيلی ) لەسەر صحيحی بوخاری .

٢-( المستخرج ) دانراوی ( ابو العونە الاسفرايينی ) لە سەر صحيحی موسلم .

٣-المستخرج ) دانراوی ( ابی نعيم الاصبهانی ) لەسەر هەردوو صحيحە كە واتە : بوخاری و مسلم .

بەلی مەبەست لە ووتەیەی كە دەلێن: (( متفق عليە )) كە مەبەستیان لە رێكەوتن یان مەرجەكانی هەردوو شێخەكەیە ئەویش بوخاری و مسلم ، كە هەردووكیان لەسەر مەرجە كانی فەرموودەی صحيح رێكەوتن ، نەك رێكەوتنی هەموو زانایانی فەرموودە بەلكو رێكە كەتن لەسەر فەرموودە صحيحيە كانی كە پی دەوترێت (متفق عليە ) هەروەها مەرجەكانیا یەك مەرجە لە فەرموودانەدا .

## دووەم : فەرموودەی ( حسن )

ئەم فەرموودە لە رووی زمانەوانیەوە : کە بە مانای جوان یان شرین هاتووە .

وەلەرووی زراوەوەکی : پیناسەی فەرموودەی ( حسن ) لە نیوان فەرموودەی صحیح و لاواز دایە ، چونکە سەندی گیرانەوە کەی ناسراوە وە زانراو بیت ، لەسەرتاوە تاکو کۆتایی یە کەی ، هەموو گیرانەوە کانی وەك فەرموودەی صحیح وایە ،بەلام لە رووی ( اتقان ) یان وورد بینی ریکخستن و بیرتیژو ( تام ضبط ) لەبەر کردنی فەرموودە کە وەك فەرموودەی صیحیح بە ناوبانگ نیە ، هەر بۆیە پی دەوتریت فەرموودەی ( حسن ) ، بەلام زۆر بە ی زانیان ( فقهاء ) ئەم فەرموودەیە بەکار دەهینین .(١)

فەرموودەی ( حسن ) سی جۆرە :

١-( صحیح لذاته ) دەبیت ئەو فەرموودەیە ( السند متصل ) واتە : گیرانەوە کانی دیارو زانراو بیت و ( معلل ) بیت ، وە ( شاذ ) نە بیت ، ئەوە ئەم فەرموودە یە ( صحیح لذاته ) .

٢-( حسن لذاته ) ،ئەگەر هیزی لەبەر کردن ( حفظ ) یان هیزی بیر تیژی ( تام ضبط ) کەمتر و نزم تربیت ،ئەوە ( حسن لذاته ) ( ٢ ) .

٣-( حسن لغیره ) ئیمامي الترمذي دەلیت : ( حسن لغیره ) ئەوا فەرموودەیە کی لاوازە ( ضعیف ) لە بنەرەتدا ، بۆیە گیشتۆتە پلەی ( حسن ) چونکە بە سەندی متصل بە جەندین ریگا دا تی پەریوە هەر بۆیە پلە ( حسن لیغرە ) هەیە .

---

١-معالم السنن ( ١/١١ص ).

٢-جامع الترمذي مع شرحة تحفة الاحوذي – كتاب العلل ( ١٠/٥١٠ص ) .

نموونەیەکی : فەرموودەی ( حسن ) کە ئیمامی الترمذي هیناویەتەوە دەلیت : (( حدثنا قتيبة حدثناجعفر بن سليمان الضبعي عن ابي عمران الجوني عن ابي بكر بن موسى الاشعري ،قال سمعت ابي بحضرة العدو يقول قال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) : (( أن أبواب الجنة تحت ضلال السيوف ... الحديث ) (١) . واتە :دەرگاکانی بەهەشت لە ژیر سیبەری شمشیر دان .

ئەم فەرموودە یە( الترمذي) دەلیت : فەرموودەیەکە ( هذا حديث حسن غريب ) چونکە پیاوانی گیرانەوەکە چوار کەس متمانەدارە واتە : ( ثقة ) تیدا ، تەنها ( جعفر بن سليمان الضعبي ) نەبیت ، هەربۆیە فەرموودە کە لە پلە ( صحيح ) وە چووە بۆ پلەی ( حسن ) . (٢)

هەربۆیە پلەی فەرموودەی ( حسن ) هەروەك فەرموودەی ( صحيح ) چەند پلە یەکی هەیە ، کە بەم پلە نەوە هەندیکی فەرموودەی ( صحيح ) کان لە هەندیکی تر جیا دە کرینەوە ، هەر بەم شیوازەش فەرموودەی ( حسن ) چەند پلەیەك هەیە .

ئیمامی ( الذهبي ) کردوویەتی دوو جۆرە :

أ-بەرزترین پلەی ئەوەی کە ( بهز بن حكيم ) لە باوکیەوە لە باپیریەوە و ( عمرو بن شعيب ) لە باوکیەوە لە باپیریەوە ، وە ( ابن اسحاق ) لە ( التيمى ) یەوە ، ئەم نموونانە ( صحيح ) ووتراوە کەلەنزمترین پلەکانی صحيح دان .

ب-الحارث بن عبدالله ) و ( عاصم بضمرة )و ( حجاج بن أرطاة ) هاو شیوە کانی .

وە ئەو کتیبانەی کە فەرموودەی ( حسن ) یان زۆر تیدایە :

١=( جامع الترمذي ) کە ناسراوە بە ( سنن الترمذي ).

٢-( سنن ابي داود ).

٣-( سنن الدارقطني ) .

٤-( المصابيح اسنة ) الامام البغوى .

٥-( المشكاة المصابيح ) الخطيبالتبريزي .

---

١-الترمذي ابواب فضائل الجهاد = ( ٥/٣٠٠ص ).

٢-في تهذيب التذهيب – ( ٢/٩٦).

## سی یه م : فەرموودەی لاوازیان (ضعیف )

ئەویش ئەم جۆرە فەرموودە یە کە سیفات و مەرجەکانی فەرموودەی (صحیح ) و فەرموودەی (حسن ) تیدانیە، بەلکو مەرج و سیفاتی لاوازی هەیە بۆ ناونراوە فەرموودەی (ضعیف ) ، بەلام بەراو بۆچوونی من مەرج نیە هە هەموو ئەو فەرموودانەی کە بە لاواز یان بە (ضعیف ) ناو نراوە ، مەرجەکانی (صحیح) یان تیدانیە ، ئەوا لاواز بن یان (ضعیف ) بن ، هەر بۆ زۆر جار لەم فەرموودە لاوازانا کە ناویان بردووە ، فەرموودەیەکی زۆر (صحیح ) هە یە دە دۆزریتەوە ، لەرووی ناوەرۆك و دەقەکەی و ە یان سەندەکەی یان لەرووی (تام ضبط ) وە ریك پیکی فەرموودە ، بەلام زانیان ئیجتهادیان بە تەواوە تی تیدا نەکردووە چونکە علم زانستی تەواوتەنها لەلای (خوای گەورەیە ) یان (خوای گەورە زانا ترە ) .

هەروەها پیناسە کەی : بەم جۆرەیە : فەرموودەی لاوازیان ((ضعیف ) رەد کراوەتەوە بە هۆی سەنەدەکەی (السقط الاسناد ).

هەروەها فەرموودەی (ضعیف ) رد کراوەتەوە بەهۆی تانەوە یان تاوانبار کردنی گیرارەوە کەی (الطعن الرواي ) .

هەروەها فەرموودەی (ضعیف ) لەرووی زمانەوانی بەمانی (ضعیف ) دژی بەهیز واتە : (القوی ) هەروەها ووشەی (ضعیف ) دوو مانەی هەیە (حسی ) یان (معنوی ) ئیما مەبەستمان بە مانا (معنویە ) .

بەکوورتی هەرفەرموودەیە لە دوای پلەی صحیح و حسن بیت بە لاواز یان بە (ضعیف ) دادەنریت لە رووی سیفات مەرجەوە .

نموونەی : فەرموودەی لاواز یان (ضعیف ) کە (ئیمامی الترمذي هیناویەتەوە دەلیت : لە ری (حکیم الاثري ) ئە ویش لە( ابي تمیمة الهجیمي ) ئە ویش لە (ابو هریرە ) ئە ویش لە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : ((من اتی حائضا او امرأة في دبرها او کاهنا فقد کفر بما أنزل علی محمد (صلی الله علیه وسلم ) ..)) (١) . واتە : ئەوەی بچیت لای ئافرەتیك کە لە (حائضا ) یان لە دواوە بچیتە لای ، یان بچیت لای فالگراوە یان جادو گەریك ،وەك ئەوە وایە کوفری کردبیت ، بەوەی کە دابەزیوەتە سەر محمد (صلی الله علیه وسلم ) کە قورئانی پیرۆزە .

پاشان کە (ئیمامی الترمذي ) دە لیت : ئەم فەرموودەیە : ناناسراوە نازانین تەنها لەریگای (حکیم الاثري ) ئەویش لە (ابی تمیمە الهجیمی ) ئەویش لە (ابو هریرە ) پاشان پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) .

واتە : ئیمامی بوخاری دەلیت : ئەفەرموودیە لاوازە لە رووی (سەندەوە ) .

دەلین :چونکە (حکیم الاثري ) هەیە ،زانایان بە لاوازیان داناوە .

---

١-الترمذي مع شرحه (١/٤١٩-٤٢٠ ).

## حوکمی گێرانەوەی فەرموودەی لاوازی یان ( ضعیف )

له لای هەندیك لە زانایانی فەرموودە یان زانایانی تریش درووستە فەرموودە ی ( ضعیف ) وە ( تساهل ) یان ئاسانکاری کردن لە ( سەندە ) کانیاندا بەبی باس کردن و روون کردنەوە هۆکاری لاوازیە کەی یان ( ضعیف ) یەکەی ئەمەش بۆ کاریکی چاکە وە ری نمووی ردنی موسلمانان ، بە پیچەوانەی فەرموودەی هەلبەستراو یان ( الحدیث الموضوع ) ئە م جۆرە فەرموودە درست نیە بۆ گێرانەوە ، کە ریوایەت بکریت ، چونکە خاوەنەکەی دە چیتە دۆزەخەوە ، ئەوی بیگریتەوە بەدەمی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ).

گێرانەوەی فەرموودەی لاواز بە دوو مەرج دەبیت کە بیان گیریەوە :

١-نابیت پەوەندی هەبی بە بەشی بیرو باروەوە ،وە یان صیفاتە کانی ( خواگەورە ) وە .

٢-نابیت بۆ ریسا کانی ( احکام ) شرعیەکان پی روون بکریتەوە ، بەتایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندی بە حەلال و حەرامەوە هەیە.

بەلی دورستە فەرموودە کانی لاواز یان ( ضعیف ) گێرانەوەیان یان ریوایەت کردنیا ، ئەویش بۆ چاکە کردن ئامۆژگاری کردن و یان هاندان زەوقدان وەك ( ترغیب ) یان ترساندیان وەك ( ترهیب ) و یان گێرانەوەی چرۆکە بە سوودە کان بۆ هیدایەت دان، کە ئاسانکاری کردوە لە ریوایەتەکانیاندا وەکو : ( سفیان الثوري ) ، یان ( عبدالرحمن بن مهدي ) ، یان ( ئیمایمي احمد بن حنبل). (١) ، ئەمەنە چەندی فەرموودەی لاوازیان هیناوە بۆ بەریر هینانەوەی قیامەت ژیانی دونیا ، تاوە کو بیتە ئامۆژگاری هیدایەتدان .

بەلام لە کاتی گێرانەوە بلی : قال رسو الله ( صلی الله علیه وسلم ) یان ( رسول الله ( صلی الله علیه وسلم ) واي فةرموو ، بەلکو دەبیت بلی : عن رسو ل الله ( صلی الله علیه وسلم ) یان بلی : فلان شت لە پیغەمبەرەوە ( صلی الله علیه وسلم ) رایوایەتکراوە ، یا نخو بلی : ( بلغنا عنه کذا ) یان لەوەوە فلان شتمان پی گەیشتووە ، یان هاوشیوەی ئەمانەی باسمان کرد ، نابیت بدریتەوە پال پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە کاتیك دا باش شارە زابیت بزانیت کە فەرموودە کە هەموو مەرجەکانی لاوازی هەیە .

---

١-علوم الحدیث ص٩٣ ، والکفایة ( ١٣٣-١٤٣ص )

# حوكمی كار كردنی به فەرموودەی لاواز یان ( ضعیف )

بەلی زانایانی فەرموودەناس جیاوازیان هەیە لە سەر  حوكمی كاركردن بە فەرموودەی لاواز ، ئەوەیە كە جمهوری زانایان لەسەر ئەوە كۆكن كە كار كردن پیی لە ( فضائل لاعمال ) واتە : گەورەی چاكەكردن چاكە كاری ، بەلام بەسی مەرج :

كە ( حافظ بن حجر ) روونی كردۆتەوە  ئەمانەن :

أ-نابیت لاوازیەكەی یان ( ضعیف )یەكەی زۆر بیت ، بەلكو دەبیت كەم بیت .

ب-دەبیت ئەو فەرموودە یە لە ژیر یاسایەكی گشتی دا كاری پی بگریت ،یان لەژیر یاساكانی ئیسلام جیگای ببیتەوە بگونجی .

ج-نابیت لە كاتی كار پی كردنی دا باوەر وابیت ، كە تەواوی ئەوفەرموودەیە جیگیرە و ( ثابت ) بووە ، بەلكو پیویست ( أحتیاط ) بكریت .

ناسراو ترین ئەم نووسەرانەی یان ئەو كتیبانەی  كە فەرموودەی لاوازیان ریوایەت كردووە  ئەمانەن :

١- كتیبی ( الضعفاء ) نووسە رە كە ی ( ابن حبان ).
٢- كتیبی ( میزان الاعتدال ) نووسە رە كە ی ( الامام الذهبي ) .
٣- كتیبي ( المراسیل ) نووسە رە كە ی ( ابو داود ) .
٤- كتیبي ( العلل ) نووسە رە كە ی ( دار قطني ).

# ئەو فەرمووده لاوازانەی یان( ضعیف ) بە هۆی جەند هۆكاریكی سەرەكی لاواز دەبن

## یەكەم : فەرموودەی ( مرسل ) یان وەرگیراو

ئەوەیە كە كەسیكی تابعین یان شوینكەوتووە فەرمووده كەی گیرابیتەوه ، راستە خۆ لە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بەبی ئەوە ی ناوی هاوەلیك یان صحابی یەك بینەوە بلی ئەو هاوە لەم بیستووه یان لەوە وە هاوەلەوە ریوایەتكراوە ، واتە بەكورتی ناوی هاوەلە نە هاتبیت ، پچرانی هەبیت ، راستەو خۆ بەبی باسی ئەو هاوە لە بەلی پیغەمبەری خواوە ( صلى الله عليه وسلم ).(١) .ئیمامی مسلم لە قەدیمەكەیدا دەلیت : فەرموودی ( مرسل ) نابیت بنچینەی بەلگە بۆ فەرموودە .

نموونەی فەرموودەی : ( مرسل ) كە ئیمامی مسلم لە كتیبە كەیدا لە كتابی ( البيوع ) دا هیناویەتەوە دەلیت :

(( حدثني محمد بن رافع ثناحجين ثنا الليث عن عقيل عن ابن شهاب عن سعيد بن المسيب أن رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) نهي عن المزابنة )). ( ٢ ) واتە : پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ریگری كردووە لە سە ودا گەری .

باسە كەمان لە سەر ( سعيد كوری المسيب ) ئەم فەرموودەیە لە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ریوایەت كردووە ، بەبی ئەوەی نیوانی خۆی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) كە صحابەیە باس بكات ، لە كاتیك دا ئەو بە خۆی تابعینە پیغەمبەری خوای ( صلى الله عليه وسلم ) نەبینیوە ، ئاماژەی بە هاوەلی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) نەكردووە ، هەروەها فەرموودە كە بەم هۆیەوە پچرانی تیدا روویداوە هەر بۆیە پی دە ووتریت فەرموودەی ( مرسل ) .

جا لە لای شرع زانان فقهاء یان الاصولی فقهە ، فەرموودەی ( منقطع ) هەر وەك فەرموودەی ( مرسل ) وایە .

لەبنچینەدا فەرموودەی ( مرسل ) لاوازە رەدكراوە تەوە ،چونكە مەرجیك لە مەرجەكانی صحيح تیدانیە و لاوازە بە سەندی متصل ) كە ی پچراوە ، هەروەها حالی ئەو راویە نەزانراوە پچراوە .

ووتەی زانایان لە سەر فەرموودەی ( مرسل )ئەم سی خالیە :

١-لاوازە رەدكراوەتەوە .

٢-صحيحە دەكریتە بەلگە . لەلای سی ئیمام : ( ابو حنيفه ) ، ( ئیمام مالیك ) ، ( ئیمام احمدی كوری حنبل )، بەلگەش ئەوەیە كە تابعین متمانەدار ( ثقة ) هە یە ،هەرگیز ئەوە روونادات بلی ( پیغەمبەری ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ئیلا كاتیك نەبیت لە متمانە پیكراویكی بیستبیت .

٣-مرسل لە كەی بە چەند مەرجیك بیت .

---

١-نزهة النظر ص٣٢ .

٢-مسلم كاتب بیوع .

## دووەم : فەرموودەی ئالۆز زاوە  یان ( المعضل )

لەرووی زمانەوانیەوە بە مانای ئیسمی مفعولە دیت ویان وەرکیراوە کە ماناکەی ماندوی کرد دیت .

هەروەها لەرووی زاراوەی ئەوەیە کەلەسەنەدەکەی دوو کەس یان زیاتر لە  بە یەك لەدوای یەك پچرابیت .

بەروونی فەرموودەی ( معضل ) ئەوەی کە دووسەند یان زیاتر دیار نەبیت و پچرابیت ، کەسە کان بزربن ، لەوانەیە کە تابیعی تابیعین یان شوین کەوتووی شوین کەوتوو فەرمووده بداتە  پال پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) بە واتای ئەوەی راوی صحابی یان راوی تابیعن دیار نەبیت راستەخۆ بدریتە  پال  پیغە مبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) بی گومان ئەم جۆرە فەرموودەیەش زۆر گرانە لە روی راست دروستی سەندی فەرموودە یان ( المعلل ) یان ( تام ضبط ) یان بیر تیژی یان ( حفظ ) .

ئەویش نموونەی : ئەم فەرموودەیە کە ( حاکم ) لە کتابی ( معرفة علوم الحدیث ) بە سەندی خۆی لە (( القعنبی ) ئەویش لە ( مالك ) کە وا ئەویش لە ( ابو هریرە ) پی گەیشتووە دەلیت : پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) فەرمووی: (( للمملوك طعامه وکسوته بالمعروف لا یکلف من العمل الا ما یطیق )) واتە : بەندە دەبیت خواردن و جل بەرگی چاکی بۆ بکردری ، وە لە توانای خۆی زیاتر ئەرکی دەخریتە سەر ).(١)

بەلی ئەم فەرموودەیە  لە ( مالك ) گری تی کەوتووە واتە ئالۆز بووە ، هە ر بەم جۆرەش لە ( موطا ني ئیمام مالك ) دا هاتووە چونکە دوو کەس یەك لەدوای یەك پچراوە ، لە نیوان ( مالیك ) و ( ابوهریرە ) دا  هەربەم جۆرەش پچراوە ، بەلام ئەگەر سەیر بکەین لە غیری ( موطا ) دا هاتووە ، بە م شیوە یە ( لە مالك ئەویش لە  محمدی کوری عجلان ، ئەویش لە باوکیەوە وئەویش لە ( ابو هریرە ) وە ... ) . ( ٢ ) . حوکمە کە ی لاوازە حالی فەرموودەی ( مرسل ) یان ( منقطع ) هە یە .

هەروەها  ( معضل ) و ( معلق ) کۆدەبنەوە لە یەك شیواز دا ، ئەگەر لە سەرتای ( سەندە کە ) دوو راوی یەك لەدوای یەك پچران ، ئەوا دەبیت ( معضل ) یان ( معلق )  لە یەك کاتدا . بەلام ئەگەر لە ناوەراستی سەنەدەکەدا دوو راوی یەك لەدوای کە پچرابوون ئەوا ( معضل ) نەك ( معلق ) بەلام ئەگەر لە سەرتای سەنەدەکەوە تەنها یەك راوی پچرا بوو ئەوا ( معلق ) وە ( معضل ) نیە .

ئەو کتابانەی فەرموودی ( معضل ) و ( معلق ) تیدا نووسراوەتەوە ( الامامی السیوطي ) دە لیت :

١-کتاب السنن ( سعید بن منصور )

٢-کتوبات ( ابن ابي دنیا ) ( ٣ )

---

١-معرفة علوم الحدیث ص٤٦

٢-معرفوة علوم الحدیث ص٤٧

٣-تدریب الراوي ( ٢١٤/١ )

## دووەم : فەرموودەی پچراو یان ( المنقطع )

ئەم فەرموودەی هەروەك فەرموودی ( معضل ) وایە فەرموودەیەکی پچراوە لە ( سەندەکەی ) دا هەروەها دژی متصل ) واتە گەیاندنی سەنەدەکە ی بەبی نە پچراوی یان ( المنقطع ) ، واتە : هەمووسەنەدیك پچرانی تیدا بیت ، جا سەنەدە کە لە سەرتاوە بیت یان لە ناوەراستی بیت ئەو ە یان لە کۆتایە کەی دابیت ، یان لە هەر جیگایەك بیت ، پی دەوتریت ( المنقطع )، هەروە ها فەرموودەی ( مرسل ) ( معضل ) و ( معلق ) دە گریتە خۆ .بەلام هەندیك بە فەرموودەی ( متأخرین ) ناویان بردووە .

هەر بۆیە ( ئیمامی نەواوی ) دەلیت : ( وأكثر ما يستعمل في رواية من دون التابعي من الصحابي كمالكعن ابن عمر ) . (١).

هەروەها ( حافظ ابن حجر ) دەربارەی فەرموودی ( المنقطع ) زۆر باسي کردووە لە کتابي ( شرح نخبة الفكر ) دا ( ٢ )

نموونەی : فەرموودەی ( المنقطع ):

وە ك : ئە وە ی ( عبدالرزاق ) لە ( ثوري ) ئە ویش لە ( ابو اسحاق ) و ئە ویش لە ( زيد ) و ئە ویش لە ( يثيع ) و ئە ویش لە ( حذيفة ) وە بە مرفوعي روایە ت کراوە کە : (( أن وليتموها ابا بكر قوى أمين )) ( ٣ ) واتە : ئەگەر ابا بکر جلە وی کاروباری گرتە دەست ئەوا ئەو کەسکی بەهیزو بە متمانەیە .

لە گیرانەوەی ئەم فەرموودە دا کەسیك برزە دیار نیە ، کە ( ثوري ) فەرموودە کەی لەوی بیستووە ، ئەویش بە ناوی ( شريك ) کە لە نیوان ( ثوري ) و ( ابو اسحاق ) دایە واتا پچرانی سەنەدەکە لەناوەراست دایە ، چونکە ( ثوري ) لە ( شريك ) فەرموودە کەی نەبیستوە بەلکو لە ( ابو اسحاق ) بیستووە ، بەلی ئەم فەرموودەیە ناودەنریت : ( مرسل ) ، و ( معلق ) ، و ( معضل ) هە روە ها ( منقطع ) .

هەر بۆیە ئەم جۆرە فەرموودە یە بە فەرموودە یەکی لاوازی یان ( ضعيف ) دادە نریت ، بە کۆ دەنگی زانایانی فەرموودە ناس ، ئەمە ش بەهۆی بی ئاگا بوونی پچرانی راویە کە .

---

١-التقريب مع التدريب ( ٢٠٨/١ ).

٢-النخبە وشرحها ص٤٤ .

٣-اخرجه الحاكم في معرفة علوم الحديث .

## سى يەم : فەرموودەی : ناوازە یان نامۆ یان ( شاذ )

ئەوفەرموودەی كەسیكی متانەدار فەرموودەكەی گیرا بیتەوە كە پیچەوانەی ئەوە بیت كە خەلكی دەی گیرنەوە ئەم ش دەبیت لەسەری بووەستین ، زانایانی فەرموودە دەلین : ئەم فەرموودەیە تەنها یەك سەنەدی هەیە ، یەكسانە كەسی متمانەدار پی شاز دەبیتەوە یان كەسی بی متمانەدار پی شاز دەبیتەوە ، وە وەستان هەیە ( موقوف ) ئەوەی كە بی متمانە دارە پیشاز بیتەوە ئەوا ئەو فەرموودەیە رەد دەكریتەوە .

هەروەها یان كەسیكی متمانەدار فەرموودە كەی ریاویەت كردووە ، بەلام ئەو رایوایەتە یان گیرانەوەیە پیچەوانەی كەسیك بیت كە لەو لە پیشتر بیت . بەلام ( حافظ ابن حجر ) دەلیت : ئەمە باوەر پیكراوە لە پیناسەی فەرموودەی ( شاز ) دا كە لەرووی زاروەوە ( إصطلاح ) وە(١). نموونە ی ئە م ریوایە تانە : كە ( الترمذي ) و ( النسائي ) و ( ابن ماجه ) لە ریی ( ابن عیینة ) وە رایوایە تي دكە ن كە لە ( عمرو بن دینا ) و ئە ویش لە ( عوسجة ) و ئە ویش لە ( ابن عباس ) : ( ئەوە یە كە پیاویك لەسەردەمی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دا مرد هیچ میرات گریك لە پاش خۆی بەجی نەما ،تەنها كۆلەیەك نەبیت ، كە پیشتریش ئازادی كردبوو .

جا ( ابن عویینە ) راویەتی كردووە تا گەیشتووتە ( ابن جریج ) ، هەروەها غیری ئەویش ریوایە تیان كردووە وەك : حماد بن زید ) پیچەوانەیان بووە تەوە رایوایەتی كردووە ، لە ( عمر و بن دینا ر ) و لە ( عوسجە ) و ناوی ( ابن عباس ) نەهیناوە لە سەنەدەكەی دا ، هەر لە بەر ئەمە ( ابو حاتم ) دەلیت : فەرموودەیەكی ( محفوظە ) لیرە دا كە ( ابن عوییینە ) وە ( حماد بن زید ) ئەهلی عەدالەتە واتە : ( ضبطي ) هە یە هەر لەگەل ئەوشدا ( ابوحاتم ) ئە و ریوایەتی ( ترجیج )داوە كە ژمارەیان زیاترو لەو. هەروەها فەرموودەی شاز لەرووی متنەوە پیچەوانەیە كە متنی یان ناورۆكی دەفكە لە گەل ناوەرۆكی دەقیكی تروە جیاوازە لە چەند راویەتیك دا بۆ نموونە : شاز لە متن دا وەك : ئەوەی كە ( ابو داود ) و ( الترمذي ) ریوایەتی دە كە ن لە فە رموودە ي ( عبدالواحد ابن زیاد ) ئە ویش لە ( اعمش ) و ئە ویش لە ( ( ابو صالح ) و ئە ویش لە ( ابو هریرە ) وە ، فە رموودە كە بة مرفوعي هاتووە واتە سە ندە كە ي تە واوە بە لام متني پیچەوانیە وەك : (( إذا صلی احدكم الفجر فلیضطجع عن یمینه ))

واتە : كەسیكیتن كە نویژی بەیانی كرد ، دوای نویژە كە لەسەر لای راست رابكشی . ئیمامی البیهقی دەلیت : ( عبدالواحد ابن زیاد ) پیچەوانەی زۆر كەس بۆ تەوە لەبارەی ئەم فەرموودەوە ، چونكە خەلكی ریوایەتیان كردووە وەك كرداری پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) نەك وەك ئامۆژگاری یان ووتەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بەلكو پیغەمبەری ( صلی الله علیه وسلم ) بەشیوازە رادەكشا دوی نویژی بەیانی ، بەلام ( عبدالواحد ) پیچەوانەی كردتەوە دەلیت : ئامۆژگاری كردووین یان بەشویەیە فەرموویەتی ، جا ( عبدالواحد ) لە نیوان ئەو هەموو هاوریەیە ی ( اعمش ) بە تەنهایە بەم ( لفظ ) تایبەتەی خۆی ، هەربۆیە ئەم فەرموودەیە شازە ، بەلام ئەوەی سەروە كەفەرموودی ( محفوظ ) شاز بیت ئە وا مقبول .

---

١-النخبة الحدیث ص٣٧ .

## چوارەم : فەرموودەی نەناسراو یان ( منكر )

ئەم فەرمووده یە لەرووی ریك خستن یان عدل و ضبط نا تەواوە و نەناسر اوە ،بەلكو شازیشە نامۆیە ئەودم فەرموودەیە رەد دەكریتەوە قبول ناكریت ، هەروەك لەرووی زمانەوانیەوە ئیسمی مفعول واتە : انكار یان دان پینە هینان ،دژی اقرار یان دان پی هینان ، بەلی فەرموودی ( منكر ) یان نەناسراو یان دان پینەهینان ، ئەم فەرموودەیە كە لە سەندەكەی دا راویەكە یان گیرە رەوەیەك هەبیت یان كەسە كە هەلەیەكی گەورەی هەبیت غافل وبی ئاگابیت زۆر وخرا پەی هەبیت واتە : فاسقی لی دەربكەویت .، یان ئەوە ئەگەیەنی كە كەسیكی متمانە پی كراوە ، لە گەل كەسیكی بی متمانە جیاوازیان هەبیت لە گیرانەوەی ئەم فەرمووده یەدا ، واتە كەسیكی فاسق خراپ

بیگریتەوە ، بەلام لە هەمان كاتدا كەسیكی متمانە پی كراویش بی گیریتەوە جیاوازیان زۆر بی لە رووی ( ثقة ) لە رووی ضبط و عدل و سنە دە كە یدا .

جیاوازی نیوان فەرموودەی ( شاذ ) فە رمووده ی ( منكر )

أ-( شاذ ) ئەو فەرموودەیە كە كەسیكی متمانەدار و مقبول ریوایەتی كردووە ، بەلام جیاوازی هەبیت یان دژایەتی هەبیت لە گەل كەسیكی لە پلە بەرز ترو متمانە پیكراو تر .

ب-( منكر ) ئەو فەرموودەیە كە كەسیكی بی متمانەو بی ( ثقه ) و لاواز و ( ضعیف ) دەی گیریتەوە كە جیاوازی هەبیت یان دژایەتی هەبیت لە گ ل كەسكیكی متمانەدار .

هەروەك ( شاذ ) راویە كە ی مقبول و پەسەندە ، بەلام ( منكر ) راویە كەی مقبول نیە نا پەسەندە .

نموونەی : ئەم فەرموودەیە وەك ئەوەیە ( ئیمانی النسائی ) و ( ابن ماجە ) ریوایەتی دەكەن لە ریوایەتەكەی ( ابی زكیر یحیی بن محمد بن قیس ) لە ( هشام بن عروة ) ئە ویش لە باوكیە وە ، ئە ویش لە ( عائیشە )وە بە مرفوعي : (( كلو البلح بالتمر فإن إبن ادم إذا أكله غضب الشیطان )) واتە : ووشكە خورما بخۆن ، بە خواردنی شەیتان زویر دە بیت !!!

بەلی ( ئیمامی النسائی ) دەلیت : ئەم فەرموودەیە ( منكرە ) كە ( ابو زكیر ) تیدا بە تفرد یان بە تاك هاتووە ، كە شیخیكی صالحە .، هەروەك ( منكر ) پلەی لاوازی یان ( ضعیف ) لە دوای فە رمووده ی ( متروك ) دە بیت .

## پینچەم : فەرموودەی : واز لیهینراو یان (المتروك )

ئەم فەرموودەیە ئەگەر هاتوو هۆکاری تانەلیدانەکەی لە گیراوە کە دا واتە : (الطعن في الراوي ) بەهۆکاری درۆ کردن یان (كذب في قول او في راوية ) ئەوا فەرموودە کەی بە (متروك ) ناوە هینریت ، بە وازلینراو دادەنریت ،لە رووی گیرانەوەکەیدا .

(المتروك) لە رووی زمانەوانی ئسمی مفعول ، لە زمانی عەرەبی دا کاتیك هیلکە جووجکە کەی دەرهینراو پی دەڵین : سوودی نەماوە بی کەلکە و وازلیهینراوە ، هەروە ها ئەم فەرموودەیە کە لە سەنەدەکەی دا راویە کی یان کەسیکی درۆزنە و لە ناو خەلکدا یان وازلیهینراوە بە مانایەکی تر کەسیکی گەندەلە یان ساقیتە بەدرۆزن بەناو بانگە .(١)

بەلی هۆکاری گیرانەوەی فەرموودەی بە درۆ یەك لەم دوو شتانەیە :

أ-ئەوەیە کە ئەم فەرموودەیە ریوایەت نەکرابی ، تەنها لە ریگای ئەووە نەبیت ، وە دژایەتی هەبیت لەگەل یاسازانراوە کان (القواعد المعلومه ) دا .

ب-کەسەکە ناسراو بیت بە درۆ کردن لەقسە کردنی ئاسایی دا ، بەلام درۆی لی در نەکەویت لە فەرموودەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) .

نموونەی : وەك ئەم فەرموودەیەی کە (عمرو بن شمر الجعفی الکوفی الشیعی ) لە (جابره )وە و ئە ویش لە (الطفيل) وە ئە ویش لە (علی و عمار ) وە وتوویانە : (( كان النبي (صلى الله عليه وسلم ) يقنت في الفجر ، ويكبر يوم عرفة من صلاة الغداة ، ويقطع العصر اخر ايام التشريق )) واتە :لە نویژی بەبانی دا قنوتی دە خویند ، وە لە بەیانی رۆژی عەرفە وە تا کۆتایی سی رۆژەی دوای جەژنی قوربان (الله اكبر ) ی دوای نویژە کاندا دە خویند .

جا (ئیمامی النسائی ) و (الدارقطني ) هی تریش لە سەر (عمرو بن شمر ) دەڵین : (متروك الحديث ) واتە : ئەم فەرموودەیە وازلیهینراوە یان (متروك ) ه . (٢)

بەلی پلەکانی فەرموودەی لاواز یان (ضعيف ) خراپ ترینی بە پەلەی یەکەم فەرموودەی هەلبەستراوە (الحديث الموضوع ) وە بە پلە ی دووم (متروك ) دیت لەدوای ئەویش (منكر )و(معلل ) و (مدرج ) و (مقلوب ) و (مضطرب ) جا ئەم پلە بەندیە (حافظ ابن حجر ) دە فە رموویت .(٣).

---

١- نخبة الفكر (حافظ بن حجر )

٢-ميزان لاعتدال (٢٦٨/٣ص )

٣-التدريب الرواي (٢٩٥/١ص ) و (و نخبة وشرحها ٤٦ص

## شەشەم : فەرموودەی شەل قاو یان لەرزۆك یان ( مضطرب )

ئەم فەرموودە ئەوەیە كە چەند ریوایەتیكی فەرموودەكە لە (سەند و متنە ) وە جیاوازیان هەبێت ، ئە توانریت پارسەنگی یەكیكیان بەسەر ئەویتریان دا بدریت بە هۆی یەكسان بوونیان لە دروستی رایوایەتی متمانەدار ، ئە جۆرە لاوازە ، بەلام ئەگەر جیاوازی گێرەرە وەكە یان راویە كە لە نای باوكی دا دانە پالی دابێت كە كەسەكە جیگای متمانەبێت ، لەو بارەیە دا بریاری صحیح فەرموودە كە دەدریت .

هەروەك دوو جۆرە ( مضطرب ) :

أ-( مضطرب ) في السند بۆ نموونە : ( ابو بكر ) -خوا لی رازی بیت – وتویەتی : (( یا رسول الله أراك شبت قال : شیبتنی هود وأخواتها )). ( ١ ) واتە :ئەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەتبینم پیر بوویت یان بەسالا چوویت ،ئەویش فەرمووی : سورەتی ( هود ) هاوشیوە كانی سورەتی ( هود ) پیریان كردم .

( ئیمام قطني ) دە لیت : ئەم فەرموودەیە ( مضطرب ) چونكە لەریگای ( ابو اسحاق ) وە ریوایەتی كراوە ، وە جیاوازیشی لەسەر كراوە و بە نزیكە دە جۆر هەیانەریوایەتی كردووە بە ( مرسل ) وە هەیانە بە ( موصول ) ریوایەتی كردووە ، وە هیانەلەسەر ( مسند ابو بكر ) هەروەها هەیانە بە( مسند ی ) ( ابن سعد ) هەیانەبە ( مسندی ) ( عائیشە )- خوا لی رازی بیت ، وە سەرجەم راویە كانیش متمانە پی كراون ، وە ناكریت هەندیكیان بەسەر هەندیكیات ( ترجیح ) بدریت ،وە پاشاویس هەیە بۆ ئەم كۆ درنە لەنیوانیاندا .

ب-( مضطرب ) في المتن بۆ نموونە : وە ك ( ئیمامي الترمذي ) لە ( شريك ) ئە ویش لە ( ابو حمزة ) ئە ویش لە ( الشعبي ) یە وە ئە ویش لە ( عائیشە كچي قیس ) بووە – خوا لی رازی بیت – ریوایە تي دە كات دە لیت : سئل ر سول الله ( صلى الله عليه وسلم ) عن الزكاة قال : أن في المال لحقا سوى الزكاة ) واتە : لە ساماندا جگە لە زەكات مافی تریشی هەیە ، وەك خیر كردن .

هەروەها لە جەند ریوایەتیكی تردا لە متنی جیاوازە وە ( ابن ماجە ) هی تریش ...

بەناو بانگ ترین كتیبی لە فەرموودەی ( مضطرب ) كتیبي ( ابن حجر ) بة ناوی ( المقترب في بيان مضطرب ).

---

١-رواه الترمذ في كتابي التفسير – تفسير سورة الواقعة ( ٩/١٨٤ص ).

## حەوتەم : فەرموودەی عەیب دار (المعلل ) یان (معلول )

بەلی ئەم فەرمووده یە کە شتیکی عەیب داری تیدا بیت کار بکاتە سەر فەرمووده کە لە فەرموودەی (صحیحه ) وە بگۆریت بۆ فەرموودەیەکی عەیب دار لاواز ، کە لە بنچینەدا عەبیکی ئاشکراو روونی هەبیت ئەم فەرموودەیە ، یان شتیکی لاواز خراپ بووپ لە فەرمووده کە دا هەبیت لە لای زانایانی فەرمووده ناس پی دەوتریش (معلول ) .(١)

هەروەها (العله ) بریتیە لە فەرموودەیە کی (غامض ) یان ناروون یان (خفي ) و شاراوە ، کەلە (صحیحی ) فەرمووده کە کەم بکاتەوە ، جا لە فەرموودەی (عله ) دوو جۆرە مەرجی هەیە کە لە فەرمووو ه کە دابیت :

أ-نادیار شاراوە بیت (الغموض والخفاء).

ب-کار کردنە سە ر صحیحي فە رمووده کە (القدح في صحة الحديث ).

بەلی (عله ) بە هۆی درۆزنی راویە کە یان غاف بوونی یان بی ئاگا بوونی راویە کە ، یان بە هۆی خراپی هیزی لەبەر کردن یان (سوء الحفظ ) بە هۆی عەیب دار کردنی (تام ضبط ) یان بي متمانە ی راویە کە ، یان (عله ) رووبەرووی سەنەدیك دەبیتەوە ، کە سەرجەم مەرجەکانی صحیحی تیدایە بە ئاشکراو دیار ، چونکە فەرموودەی لاواز پیویستی بە لیکۆلینەوە علە کەی نیە یان پیویستی بە لیکۆلینەوەی عەیب داریە کەی نیە ، چونکە خۆی لە خۆدا قبول نەکراوە رەد کراوە تەوە .

هەروەها بۆ ئەوەی کە بزانین ( ادراك علە ) کەی چۆنە یان عەیب داریە کەی چۆنە دەبیت پیشت بەم سی خالە ببەستین :

أ-(مفرد بووونی یان تاك بوونی گیرانەوە کەی (تفرد الراوی )

ب-دژایەتی کردنی کە سانی تر بۆی (مخالفە غیرە لە )

ج-عەیب دار کردنی بە هۆی درۆ زنی راویە کە (کذب الراوي )یان بەهۆی دژایەتی کردنی کار نەکاتە سەر صحیحی .

ریگای ناسینی فەرموودەی ( معلل ) بریتیە لە : کۆکردنەوەی ریگاکانی فەرموودە و سەیر کردنی رایوایەتە جیاجیاکانی ، وە بەراورد و ( موازنە ) کردن لە نیوان ( ضبط ) و ووردەکاری ( اتقان ) یاندا ، پاشان حوکم دار بەسەر ریوایەتی عبیداری ( معولە ) کەدا . بەلی بەزۆری عەیب دار یان ( علە ) تووشی سەنەدی فەرموودە دەبیت ، یان ( وقف ) یان ( ارسال ). هەروەها عەیب دار یان ( علە )تووشی ( متنی ) فەرموودەش دەبیت بە کەمی ،وەك ئەم فەرموودەی کە نهی یان نفی خویندنی ( بسم الله الرحمن الرحیم ) دە کات لە نویژ دا ، هەروەها عەیب دار یان ( علە ) زۆر جار کە کاری کردە سە سەنەدی فەرموودە کا کاریش دەکاتە سەر متنی فەرموودە کە دا ، هەر بۆ یە بەم شیوەیە عەیب داری دەکات وەك عەیب دار بوون بە ( ارسال ).

بەلام ( علە ) جاری وە ها هەیە کە کار دە کاتە سەر سەندی فەرموودە لە هەمان کات دا ( متنە ) کەشی صحیحە.

وەك نموونەی : ئەم فەرموودەیەی ( یعلی بن عبید ) لە ( ثوري ) لە ( عمرو بن دینار ) و لە ( ابن عمر ) وە بە مرفوعي لە ( البیعان بالخیار ) (( کریارو فرۆشیار مافي فرۆشیاریان هە یە ) جا ( یعلی ) وە همی بۆ پەیدا بووە ، لەسەر ( سفیان ثوري ) لە سەر قسەی ( عمر و بن دینارد ا ) ، چونکە ئەمە ( عبدالله بن دینارە ) ئەم ( متنە ) صحیحە ، هەرچەند لە سەنەدە کا عەیب دار بە هەلە چوون هەیە ، چونکە هەریەك لە ( عمرو ) و ( عبدالله بن دینار )متمانەدار جا گۆرینی متمانەدار بە متمانە پی کراوی تر زیان بە فەرموودە کە ناگەیەنیت ،بە صحیحی منتە کەی کە هەرچەندە سەنەدە کەش علە ی تیدا بیت یان عەییدار بیت .

بەناو بانگترین ئەو کتابانەی کە فەرموودەی عەییدار یان ( علە ) یان تیدایە :

١-( کتاب العلل ) ( ابن المدینی ).

٢-( علل الحدیث ) ( ابن ابي حاتم ).

٣-العلل ومعرفة الرجال ) ( احمد بن حنبل ).

٤-( العلل الکبیر ) و ( العلل الصغیر ) ( الترمذي )

٥-( العلل الواردة في الاحادیث النبویة ) ( الدار قطني ) ئەم کتابە زۆر ترین ( العلل ) تیدایە .

## هەشتەم :دژایەتی کردنی متمانە پیکراوان ( المخالفة للثقات )

ئەگەر هۆکاری تانەدان له گیرەرەوە ( طعن الراوي ) دژ بوونەوە بیت له متمانه پیکراویکدا ، ئەوە له ئه نجامی ئەم دژایەتی کردنەی متمانه پیکراوان ، پینج جۆرە کانی زانستی فەرمووده بەرهەم دیت ، کە ئەوانیش ( المدرج ، المقلوب ، المزید فی متصل الاسانید، المضطرب، المصحف ) .

١-ئەگەر مخالفه کەی یان دژایەتی کردنه کە به هۆی گۆرانی سیاقی سەندەکەوە بیت ، یان بەهۆی ( موقوف ) وەستان یان بەهۆی ( مرفوع ؟ ) بیت ئەوا به ( مدرج ) ناو دەبریت .

٢-ئەگەر مخالفه کەی یان دژایەتی کردنەکە به هۆی پیش خستن دوا خستن بیت ( تقدیم و تاخیر ) بیت ئەوا به ( مقلوب ) ناو دەبریت .

٣-وه ئەگەر مخالفه کەی یان دژایەتی کردنه کە به هۆی زیاد کردنی راویە کە بیت ئەوا به ( المزید فی متصل الاسانید ) ناو دەبریت .

٤-ئەگەر مخالفه کە یان دژایەتی کردنەکەی بەهۆی گۆرینی راویە کە له جیگای راویەکی تره وه بیت واته گۆرینی ناوی راویە کە ئەوه بیت ،یان به هۆی شەل قاو ( مضطرب ) له متنەکەی دا بیت ئەوا به ( مضطرب ) ناو ده بریت .

٥-ئەگەر مخالفه کە یان دژایەتی کردنەکە به هۆی گۆرانی ( لفظ ) کە ی له مانەوەی سیاقه کەدا بیت ،ئەوا ناو ده بریت به ( المصحف ).

## نۆیەم: شت زیاد کردن یان تیکەل کردن ( المدرج )

لە رووی زمانەوانیەو بە ئیسمی مفعول دیت ، واتە : ( أدرجت الشی بالشی ) کە مانای ( ادخلته فیه ضمنته ) واتە: کردمە ناوە تیکەلم کرد ، یان ئەو فەرموودەی کە سیاقی سەنەدەکەی گۆر درابیت ، یان شتیکی خرابیتە ناو متنی فەرموودە کەیەوە و کە سەر بە فەرموودە کەی پیشتر نەبیت بەلکو متنیکی تری پیوە لکا بیت .

( مدرج ) دوو بەشە :

١- مدرج الاسناد واتە : زیادە خستنە ناو سەنەدە کەوە .

٢- مدرج المتن واتە: زیادە خستنە ناو متنە کە ی یان شتکی تیکل بە متنەکەی کرابیت ، کە لە متنی پیشوو دا نیە بەی جیاکەروەشی . نموونەی : مدرج الاسانید واتە سەنەد وەك :چیرۆکەکەی ( ثابت بن موسی الزاهد ) کە لە ریوایە تەکەیدا هەیە ( من کثرة صلاته باللیل حسن و جهه بالنهار ). (١) واتە : ئەوەی بە شەو زۆر شەو نویژ بکات ،لە رۆژدا رووی جوان و نوورانی دەبیت . بەلی ئەصلی ئەم چیرۆکە ئەوەیە کە ( ثابت بن موسی الزاهد ) چووە لای ( شریك بن عبدالله القاضي ) کاری نووسینی دە کرد جا ووتی : ( اعمش ) لە ( ابو سفیان ) و ئەویش لە ( جابره )وە بۆ باسکردین کە دی ووت : کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویە تی .... وسکت لیکتب المستملی ) جا بی دەنگ بوو تا ( مستملی ) یەك بینوو سیت ، ( مستملی ) کەسیکە کە دەنگ دەگەیەنیت ، بۆ نموونە : کە ماموستا یان شیخە کە قوتابی زۆر بووە دەنگی بە هەموویان نەدە گەیشت ، ئەوا بە یەکیکیان ئەو دەنگەی دە گەیەنیت ، جا سەری ( ثابت بن موسی الزاهد ) کرد ووتی : ئەوی شەو نویژی زۆر بیت ، کە مەبەستی ( ثابت بن موسی الزاهد ) بوو ، لەبەر خاتری زوهدو لە خوا ترسیەکەی ، جا ( ثابت بن موسی الزاهد ) گومانی برد ئەوا متنی ئەو سەنەدەیە بۆ باسی کردوە بۆ گیرایەوە .

ادراج یان مدرج سی جۆری هەیە :

أ-دەبیت مدرج یان ادراج کە لە سەرەتایی فەرموودە کەوە بیت ، ئەمە یان زۆر کەمە بەلام زیاتر لە ناوەراستەوەیە.

ب- مدرج یان ادراج بیکەویتە ناوە راستی فەرموودە کە کە ئەمەشیان زۆر کەمە.

ج-مدرج یان ادراج بیکەویتە کۆتای فەرموودە کە کەئەمە یان زۆر ترە .

نموونە : مدرج یان ادراج لە مەتندا ، بەلی لە سەرەتای فەرموود کە دا هۆکەشی ئەوەیە کە راوییە کە یان گیرەرەوە کە قسەیەك دەکات کە دەیەویت بە فەرموودە یەك بۆ ببیتە بەلگە ، واتە: بە فەرموودە کەیەوە دەی لیکین یان یتکەلی دەکات ، جا ئەم جۆرە کەسە فەرموودە بەبی جیاکردنەوەی لە قسە کەی خۆی دا دەی هینی و دەلیکینی بە قسە کەی خۆیەوە ، جا هەر بۆیە گویگر گومان دە بات بۆ هەموو فەرموود کە .

---

١-اخرجە: ابن ماجە باب قیام اللیل ( ١/ص٤٢٢. رقم الحدیث ( ١٣٣٣).

هەروەك ( خطيب ) دەی گێریتەوە لە رایوایەتی ( ابی قطن )و ( شبابة ) – فرقهما : كە جیاكردونە تە وە لە ( شعبە ) وە ئە ویش لە ( محمد بن زیاد )وە ئە ویش لە ( ابو هريرە ) دە لیت : پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی: (( اسبغوا وضوء ، ویل للاعقاب من النار ) واتە : دە ست نویژ چاك بگرن ، هاوار بۆ باژنەی پیان لە ئاگردا ، واتە : چاك نەشوشتنی باژنەی پی هۆی چوونە ناو ئاگرە ، جا (( اسبغوا وضوء )) مدرج قسەی ( ابو هريرە ) يە ، هەروەك روون كراوە تەوە لە گێرانەوی ئیمامی بوخاری دا .

ئەو هۆكارانەی كە بەناوبانگن لە ( ادراج )دا

١-روونكردنەوەی حوكمیكی شەرعی .

٢-دەرهینانی حوكمیكی شەرعی لە فەرموودەیەكەوە پیش ئەوەی فەرموودە كە تەواو بكات .

٣-روونكردنەوەی ووشەیەكی شاز یان نامۆ یان ( غريب ) لە فەرموودە كەدا .

چۆن هەست بە ( ادراج ) دە كريت ؟ ادراج هەستی پی دەكريت بە يەكيك لەم شتانە :

١-هاتنی بەجیاكراوی لە ریوایەتیكی تردا .

٢-هاتنی دەقی قەسەیەكی پیشەوایانی فەرموودە ناس ،وە ئاگاداری لەسەری .

٣-دا پیداهینانی خودی راویەكە لەسەر ئەوەی كە قەسەیەكی ( ادراج ) ی كردووە لەو فەرموودە دا .

٤-دوور بوون لەوەی كە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) شتی وای فەرموو بیت .

( مدرج ) یان ( ادراج ) حوكمی پی ناكريت ،جگە لەوەی كە شرع زانان یان فەرموودە ناسان بۆ لیكدانەوەی ووشەیەكی نامۆ بەكاریی دینن ،بەلی ( مدرج ) مقبول نیە كاری بی ناكريت .

بەناو بانگترین كتیبە كانی ( مدرج ) یان ( ادراج ):

١-( الفصل للوصل المدرج في النقل ) نووسە ر ( خطيب بغدادي ).

٢-( تقريب المنهج بترتيب المدرج ) نووسە ر ( ابن حجر ) .

## دەیەم : وەرگیراو یان (المقلوب )

لە رووی زمانەوانی ئیسمی مفعول وە لە (القلب ) وەر گیراوە ، بریتیە لە گۆرینی شتی لەرووەی کەی لەسەریەتی ( تحویل الشی عن وجه )(١)

هەروەها (المقلوب ) بریتیە لەوەی کە شتیك یان وەشەیەك یان رستەیە قلب کرا بیت ،یان وە گیرابیت بەروویەکی ترە وە ،یان گۆررنی (لفظ ) بە (لفظ ) یکی تروە ، یان گۆرینی منتی فەرموودە کە ، بە منتیکی تروە ، یاخود دوا خستنی یان پیش خستنی (تقدیم و تاخیر ) .

هەروەك لە (المقلوب فی الاسناد ) او (المقلوب فی المتن )

١-(المقلوب فی الاسناد ) سەندی فەرموودە کە وە گیراوە ، ئەوەیش ئەوەی کە راویە کە ناوی راویە کان یان ناوی باکی پیش و پاش کردبیت ، بۆ نموونە وەك : ئەفەرموودەیە : (کعب بن مره ) کەچی راویە کە مقلوبی کردووە گۆریتی بە (مره بن کعب)، وە یان ئەوەیە گیرەروەکە کەسیکی گۆری بیت بە کەسکی تروە ، بەمەبەستی نامۆ بوون و سەر سور مان ئەوەی کە ناوی کیرەوەوە کە ی فەرمووده کە لە ناوی (سالم ) وە بکات بە (نافع ) .

٢-المقولب المتن ) وا تا جی گۆرکی لە متنەوە روویدا بیت ، ئەوەی ئەوەیە کە راویە کە هەندیك لە متنی فەرموودە کەی پاش پیش کردبیت ، وە ك نموونەی ئەم فەرموودەی کە جی گۆر کی پی کراوە کە دە فەرموویت (ورجل تصدق بصدقەفاخفاها حته لا تعلم یمینه ماتنفق شماله ) گۆردراوە بە (حتی لاتعلم شماله ما تتفق یمینه ) .(٢) واتە :شمال یمین جی گۆرکی پیکراوە .

یان ئەوەی گیرانەوەی متنی ئەم فەرموودەی بە سەندیکی تر بهینی ، وە سنەدی ئەم بۆ فەرموودەیەکی تر بەکار بهینی .ئەمەش ئەوە بوو خەلکی بغدا بۆ تاقی کردنەوەی (ئیمامی ) بوخاری کردیان (١٠٠ )فەرموودەیان بۆ قلب کرد یان هەلگیرایەوە ، و پرسیارین لی کرد ئەویش هەمووی وەلام دایەوە وەك پیش خۆی کە مقلوب نەکرا بوون .

حوکمی فەرموودەی مقلوب بۆ مەبەستی رغبەت بیت دروست نیە ، بەلام بۆ مەبەستی تاقی کردنەوەبیت دروست وە ئیمامی بوخاری پی تاقی کراویەوە .

بەناوبانگ ترین کتبی فەرموودەی مقلوب :

١-کتیبی (راع الارتیاب ی المقلوب من الاسماء الالقاب ) (خطیب بغدادي).

# ﴿ دابەش كردنی فەرمووده بەگویرەی گەیشتنی بە ئیمە ﴾

## یەكەم : فەرموودەی ( متواتر )

مەرجەكانی وەرگرتنی فەرموودەی ( متواتر )

١-دەبی ژمارەیەكی زۆر ئەم فەرموودەیە بگیرنەوە كە لە ١٠ ) كەس بن .(١)

٢-دەبێت ئەم ژمارە زۆر لە سەرجەم ئاستەكانی سەندەكە دا هەبن .

٣- پویستە ئەو فەرموودەیە كە هەست كردن بە پشتگیری لیوە بكات ،وەك : بلین : بیستمان ، بینیمان ،یان بەری كەوتین .

دەبیت عادەتیان لە بیت لەسەر درۆ كۆببنەوە .

حوكمی فەرموودەی متواتر كاری پی دە كریت لەسەرجەم ئاستەكاندا احكامەكانی شرعی و بیرو باوەر وە .

فەرموودەی متواتر دە كریت بە دووبەش : ( متواتر لفظي ) و ( متواتر ( معنوي )

١-( متواتر لفظي ) وە ك ئە م فە رموودە یە : (( من كذب على متعمدا فليتبوا مقعده من النار ).

٢-( امتواترمعنوي ) وە ك : ئەوەی فەرموود زۆر هاتووە لەسەر ئەوەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە كاتی دوعا كردن ونزا پارانەوە جا دەستە كانی بەرز كرۆتەوە .

هەروەها فەرموودەی متواتر كەلەوانە ( حەوزی كوثر ) فەرموودەی ( مسح كردن لە سە رالخف یان گۆرەوی ) یان ( بەرز كردنەوەی دەست كانی لە دوعا كردن ) .

بەناو بانگ ترین كتیبی متواتر :

١-( الازهار المتناثرة في الاخبار المتواترة ) نووسە ر ( ئیمامي سيوطي ) .

٢-( قطف الازهار ) نووسە ر ( ئیمامي سيوطي ).

٣-( نظم المتناثر من الحديث المتواتر ) نووسە ر ( محمد بن جعفر ).

---

١-تدریب الراوی ( ٢/١٧٧ص ) .

## دووەم : فەرموودەی ( احاد )

فەرموودەی ( احاد ) بەمانای ( واحد – یەك ) دیت ، واتەك هەوالی یەکە سە ( خبر واحد ) بەمانایەکی تر ئەوەی کە یەکەس ریوایەتی کردووە ، مەرجەکانی تواتری تیدا نیە .

حوکمە کەی لەسەر زانستیەی کە تیروانینی بەلگە دار کردن واتە : ( الاستدلال ) وە ستاوە .

بەلی فەرموودەی ( احاد ) برییتیە لە هەموو فەرموودەیە ك کە مەرجەکانی متواتری تیدا بەدەست نەهاتبیت ،وە ناو دە بریت ( خبری احاد ) یان ( هەوالی تاکە کەسی ) ئەویش بریتیە لە سی بەشی سەرەکی :

یەکەم : عزیز

دووەم :غریب

سی یەم : مشهور

هەروەك چۆن پیشەوا ( ابن حجر ) دەلی : ( هەوالی ( احاد ) حوجەیە وپیویستە وەر بگیریت لە بیروباوەر و جگە لە بیرو باوەر یش دا ، بەمەرجی ئەوەی سەنەدە کەی راست بیت .( ١ )

وەلامیك بۆ ئەو کەسانەی کە دەلین : فەرموودەی ( احاد ) بۆ بیرو باوەر بە کار ناهینریت واتە حوکمی پی ناکریت ..؟!

بەلی ئەوانەی دەلین : فەرمووودەی ( احاد ) حوکمی پی ناکریت لە سەر ئەحکامی بیرو باوەر چونکە بیرو باوەر لەسەر فەرمووودەی گوماناوی دانامەزریت واتە فەرمووودەی ( احاد ) بەلی ئەم بۆ چوونە دروست نیە چونکە بۆچوونی دروست ئەوەیە :

١-ئەوەی دەلیت فەرمووودەی ( احاد ) گومان دەبەخشیت بەرەهایی نیە ، بەلکو هەندیك هەندیك فەرمووودەی ( احاد ) هەیە بە یەقینە و دلنیایی دەبەخشیت ئەگەر بیت و نیشانە و ئامژە ( القرئن ) لەسەر راستیتی ، هەر وکو ئەوەی ئومەتی ئیسلام ئەوفەرمووودەیان بەلاوە وەرگیراو بیت وەکو فەرمووودەی ( عمری کوری ختاب ) – خوا لی رازی بیت – (( انما اعمال بالنیات )) ئەم فەرمووودەیە ( احاد ) واتە : هەوالە کە تاکە کەسی یە فەرمووودە کە تەنها ( عمری کوری ختاب ) گیرایەتەوە لە گەل ئەوەشدا باش دەزانین کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علی وسلم ) ئە فەرمووودەی ، فەرمووە راست دروستە هیچ گومانی تیدا نیە .

٢-هەروەها پیغەمبەری خوا( صلی لله علیه وسلم ) تاکە کەسی ( یرسل الاحاد ) دنارد بۆ پاشایان بۆ ئەوەی بنچینەکانی ئاینی ئیسلام بنەماکانی بیرو باوەر بگەیەنی بە ( شهاد ان لا اله الا الله وان محمد ا ر سول الله ) وە ئەم هەوالە ناردنەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) حوجیە لەسەر خەلکی وپیویستە پیوە پابەند بین ، هەر وەك نیردراوەکانی نارد خۆ تاکە کەس بوون بۆ لای پادشایان میلکە کان سەرۆك هۆزەکان نامەی پیغەمبەری خوا بۆ بردن ،یان ( معاز کوری جبل ) ی رەوانەکرد بۆ یەمەن خۆ ئەویش هەوالیکی ( احاد ) بۆ خەلکی یەمەن ، وە نیرداوە کەش بە حوجە حیسا بکرا کە پیویست لەسەر خەلکی وەلاتی یەمەن قبول ی بکەن .

٣- ئەگەر بلین ( بیرو باوەر بە هەوالی ( احاد ) دا ناچەسپیت ، ئەوا دە گونجیت کە بلین : بابە تەکانی دیکەی جگە لە بیرو باوەر ( الاحکام العلمیه ) بە هەوالی ( احاد ) نا چەسپیت ، چونکە بابەتە کانی دیکەش ئەو بیرو باوەرەی لە گەلە کە ( خوای پەروەردگار ) فەرمانی بەم کارە کردووە یان ریگری لی کردووە ، ئەگەر ئەو ووتەیەش وەربگیریت ئەوا زۆریك لە حوکمەکانی ئاینی ئیسلام پەك دەخریت ، وە ئەگەر ئەم م قسەیەش رەد بکریتەوە ئەوا با ئەم قسەیەش رەد بکریتەوە کە دەلیت : ( بیرو باورە بە هوالی احاد ناچەسپیت ) چونکە هیچ جیاوازی لە نیوانیاندا نیە ..!!

٤- ( خوای گەورە ) دەرمانی کردووە بە کەسانەی کە نەزانن بگەرینەوە بۆ قسەی زانیان لە بواریکدا کە لەبابەتەکانی بیرو باوەر مەزن تر گەورە ترە ئەویش بریتیە لە پەیامی ئیسلام وەك ( خوای گەورە دە فەرموویت ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُوحِي إِلَيْهِمْ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (٤٣) بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ النحل ٤٣-٤٤ . بی گومان فەرمووودەی ( احاد ) قبول دەکریت لە( الاحکام العلمیه ) بیرو باوەر یان لە ( الاحکام العلمیه ) زانستی شرعی یان فقهی ، وەهیچ بەلگەیەکیش نیو بۆ جیاوازی کردنیان ، بەلام فەرمووودەی ( احاد ) پیویست سەنەدەکەی راست روست بیت .( ١ )

---

١-فتاوە العقیدە ( ص١٨ ) الشیخ محمد بن صالح العثیمین . رحمە الله .

## سی یەم فەرموودەی بەناو بانگ ( المشهور )

ئەم فەرموودەیە بریتەیە لەوەی کە فەرموودەیە کی بەناوبانگ و دەرکەوت و ناسراوە ، ئەوەیە : کەلە(٣) کەس زیاتر ریوایەتی ئەم جۆرە فەرموودەی کردبێت ، بە جۆریکە کە نەگاتە بە پلەی (متواتر ) .

نموونەی : فەرموودەی (المشهور) یان بە ناوبانگ (( أن الله لا يقبض العلم انتزاعا ينتزعه )) (١) واتە : خوا زانست زانیاری لەد لە کاندا ناشتووە بەدار نین دا ینارنی لە دل و دەروونی خەلکدا ....

(المشهور غير الاصطلاحي )

نموونەی : ئەم فەرموودەیە (مشهور ) لە (انس ) وە (( ان رسول الله (صلى الله عليه وسلم ) قنت شهرا بعد الركوع يدعوا على رعل وذكوان ) (٢) واتە : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليهوسلم ) دوای روکوع قنوتی دەخویند کە تیایدا دوعای لە هەر دوو هۆزی (رعل ) و ( زکوان ) دە کرد .

نموونەی: المشهور وەك ئەم فەرموودەیە (( المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده )) (٣) واتە : موسلمان ئەوەیە کە موسلمانان لە زمان و دەستی پاریزراو بن .

نموونەی: المشهور وەك ئەم فەرموودەیە (( أبعض الحلال الى الله الطلاق )) (٤). واتە : رق بوونەوە ترین حەلال لەلای خوا تە لاقە . حوکمەکەی فەرموودەی المشهور هەروەك فەرموودەی کە بە جۆرە هەیە (صحيح ) یان (حسن ) بەلکو هەشیانەفەرموودی لاواز هەلبەستراو (ضعيف ) یان (الموضوع ) فەرموودەی المشهور بە پێش فەرموودەی (عزيز ) و (غريب ) دە خریت .

بەناوبانگ ترین کتابەکانی فەرموودەی المشهور :

١-(المقاصيد الحسنة فيما اشتهر علي السنة ) نووسە ر (الامام السخاوي )

٢-( تميز الطيب من الخبيث فيما يدور على السنة الناس من الحديث ) نووسە ر (ابن البديع الشيباني )

---

١-اخرجه : الترمزی و ابن ماجه .

٢-اخرجه الشيخان

٣-متفق عليه

٤-صححه الحاكم فى المستدرك .

## چوارەم :فەرموودەی دەگمەن ( العزيز )

العزيز: لەرووی زمانەوانیەوە صیفە موشبە هەیە ( عز – یعز ) بە کسرە – وەرگیراوە ، واتە کەم وینە و دەگمەن یان ( عز – یعز ) بە فتحە واتە : بەهێز توونتد ، وە لەبەر کەم وینەی و دەگمەنی و بەهێزیەتی لەبەر ئەمە بەریگای تروە هاتووە .

هەروەها ( العزيز ) کە گێرە رەوە کانی یان راویە کانی لە ( ٢ ) کەس کەمتر نەبن لە تەبەقە و ئاستە کانی سەندە کەیدا ، واتە : فەرموودەی العزیز لە هەر تەبەقەیەکدا لە تەبەقەکانی سەندە کەی دا نابێت ، لە دوو کەس کەم تر بێت ، لە گێرانەوە ی راویەکانی ، وە لە هەندیك تەبە قەدا راویەکان لە ( ٣ ) زیاتر بوون ، ئەوا زیانی نیە بەمەرجی ، ئەگەر تەنها لە هەر تەبەقەیەکیشدا ( ٢ ) بمێنیتەوە ، چونکە کەمترین تەبەقە لە تەبەقە کانی سەند حیسابی بۆ دەکریت . ( ١ )

هەروەها زانایانی فەرموودە ناس د ەلێن : فەرموودەی العزیز ئەوەیە کە( ٢ ) کەس یان ( ٣ ) کەس ریوایەتی بکەن ، وە لەهەندیك جیاوازی فەرموودەی مشهور جیایان نەکردۆتەوە .

نموونەی فەرموودەی العزیز : کە بوخاری و مسلم ریوایەتی دەکەن و، لە فەرموودە کەی ( انس ) وە بوخاری لە فەرموودەی ( ابو هریرە ) ریوایەتی دەکات کە پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : (( لایؤمن احدکم حتی اکون احب الیه من والده وولده والناس اجمعین )) ( ٢ ) واتە : ئیمانی کامل نیە یان باوەری تەواو نیە هیچ کەستان تا منی لە باوك و دایکی و منالە کانی و سەرجەم خەلکی خۆشتر نەوی . بەلی وەك ( قتادە ) و ( عبدالعزیز بن صهیب ) یش لە ( انس ) وە رایوایە تیان کردووە ، وە هەر وەها ( شعبە ) و ( سعید ) و لە ( قتادە ) وە گێراویانەتەوە ، وە ( اسماعیل بن علبە ) و ( عبدالوارث ) یش لە ( عبدالعزیز ) وە ریوایە تیان کردووە ، وە ریوایە تیشی کردووە لە سە رجمیانە وە .

وە زانایانی فەرموودە ناسی هیچ کتێبیك یان نووسراویکیان لەسەر دانەناوە چونکە بە هۆی دەگمەنی کەم وینەی ئەم جۆرە فەرموودانەی العزیز ، چونکە ناوەکەی هەر بە خۆ وەیە العزیزە کەم وینە و دەگمەنە .

---

١-النخبە وشرحها ٢١-٢٤ص

٢-البخاری و مسلم .

## پێنچەم : نامۆ ( غريب )

فەرموودەی ( غريب ) لەرووی زمانەوانی ئەویش صیفە موشبە هەیە ، بە مانای ( منفرد ) یان تاك دیت و یان بە مانای دوور لە دەوروبەریە وە دیت . فەرموودەی ( غريب ) واتە : ئەوەیە کە تنها راویەك بەتەنها ریوایەتی بکات ، واتە : تاکە کەسیك بیگێریتەوە بەتنها ، بەلی واتە ئەم فەرموودەی کەسیك بە سەربەخۆیی دەیگێریتەوە ، ئیتر یان لە هەموو تەبەقەیەکدا لە تەبەقە کانی سەنەدەکە دا یان لە هەندی لە تەبەقەکانی سەنەدەکەدا ، بەلام هەرچەندە لە تەنها تەبەقەیەکیشدا بیت ، وە زیاتر لە کەسیك لە تەبەقەکانی تری سەنەدەکەدا زیان ناگەیەنیت ،چونکە لای کەمە کە حیسابە .

فەرموودەی ( غريب ) دابەش دە کریت بۆ دوو بەش : ( غريب المطلق ) او ( غريب النسبي )

أ-( غريب المطلق ) واتە : نامۆی بی ناو ناتۆرە ، ئەوەیە کە غریب بوونەکەی کە لەئەصلی سەنەدەکەدایە ، واتە : کە کەسیك بە تاك لەئەصلی سەنەدەکەدا ریوایەتی بکات (١) نموونەی : ئەم جۆرە غریبیە : (( أنما أعمال بالنبيان )) ( ٢ ) واتە : هەموو کارو کردەوەیەك بە نیەتە . هەروەها کاتیك صحابیە ك بە تەنها فەرموودە کە ی گێرایەوە ئەوا بە فەرموود کە بیە غريب مطلق حیساب دە کریت . چونکە ئەوفەرموودەیە (( أنما أعمال بالنبيان )) تەنها ( عمری کوری ختاب ) ریوایەتی کردووە ، هەر بەم شێوازە ئەم تاکە کەسیە بەردە وامە تا کۆتایی سەنەدەکە .

ب-( غريب النسبى ) ئەوا غريب بوونیە کەی لە سەنەدا کەی دایە واتە : راویەك زیاتر لە سەنەدەکەیدا دەی گێرنەوە ، پاشان راوییەکی ئەصلی تاك رەوانە ، لەو راویانە ریوایەتی بکات .

بۆنموونە : لە ( مالك ) ئەویش لە ( زهری ) وە ئەویش لە ( انس ) دەلی : ( پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) (( دخل مكه على راسه المغفر )) ( ٣ ) تەنها ( مالك ) لە ( زهری ) ریوایەتی کردووە .

بەناوبانگی کتیبە کان و نووسراوە کانی فەرموودەی ( غريب )

١-کتیبی ( مسند البزار) .

٢-کتیبی ( معجم الاوسط ) ( الطبراني ).

٣-کتیبي ( غرائب مالك ) ( الامام الدار قطني ).

٤-کتیبي( السنن التي تفرد بكل سند منها اهل بلدة ) ( ابو داود السجستاني )

---

١-نزهة النظر ص٢٨.

٢-اخرجە : الشيخان

٣-اخرجە : الشيخان

## شەشەم : فەرموودەی بەرز کراوە ( المرفوع )

بەلی فەرموودەی : بەرزکراوە یان مرفوع و ناوە کەی کە بەخۆ وەیە بەرز دەکریتەوە ، کەبریتیە لە ( قول ) ووتانەی یان ئەو ( فعل ) کردارانەی ، یان ئەو صیفە تانەو یان ( تقریر ) دە خریتە پال پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ، بەلی فەرموود کە دراوە تە پال پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئیتر ( قول ) یان ووتە بیت ، ( فعل ) یان کردار بیت ، ( تقریر ) یان پەسەند کردن بیت ، ( صیفە ) یان ئاوەلناو بیت .

١-مرفوع بە ووتە ( قول )

٢-مرفوع بە کردار ( فعل )

٣-مرفوع بە پەسەند ( تقریر )

٤-مرفوع بە ئاوە لناو ( صفە )

وە نموونەی ئەم چوار بەشە :

١-مرفوع قولی : قال رسو ل الله ( صلی الله علیه وسلم ) کذا ........

٢-مرفوع فعلي :فعل رسول الله ( صلی الله علیه وسلم ) کذا ............

٣-مرفوع تقریر : فعل بحضر النبي ( صلی الله علیه وسلم کذا ............

٤-مرفوع الصفة : کان ر سول الله ( صلی الله علیه وسلم ) احسن الناس خلقا ......

## حەوتەم : فەرموودەی وەستینراو ( الموقوف )

ئەم فەرموودەیە بەمانیا وەستان یان وەستینراو دیت ، وە ئەوەی کەراویە کە فەرموودە کەی لە سەر صحابیەك وەستاندبی ، وە شوینی ئەوەی کە ماوە لە زنجیرەی سەنەدەکەیدا نەکەوتبیت .

هەروەها ئەم فەرموودەی دەدریتە پال صحابی ، ئیتر ( قول ) ووتەبیت یان ( فعل ) و کردار بیت یان ( تقریر ) پەسەندبیت ، ئیتر چۆنیەتی ئەو فەرموودەی ( متصل ) یان پەیویست بیت ، یان ( منقطع ) پچراو بیت .

بۆ نموونە : الموقوف قولی : ( قال علي بن ابي طالب – رضي الله عنه – حدثوا الناس بما يعرفون ، اتريدون ان يكذب الله ورسوله ) ( ١ ) واتە : پیشەوا علی کوری ابی تالیب – خوا لی رازی بیت – دەفەرمووی : ئەو شتانە بۆ خەلك باس بکەن کە دیزانن ، ئایا دەتانەویت درۆ بەدەم خواو پیغەمبەرەکەیەوە ( صلی الله علیه وسلم ) بکەن ؟ .

نموونە ی الموقوف الفعلی و وەك فەرمایشتەکەی بوخاری دەلیت : ( و أم ابن عباس و هو متيمم ) ) ( ٢ ) واتە : ابن عباس پیش نویژی کرد لە کاتیکدا تیمومیشی کرد بوو .

نموونەی الموقوف تقریر ، وتەی هەندیك لە تابعین : (( فعلت كذا امام احد الصحابة ولم ينكر على )) واتە: لەبەردە م یەکیك لە صحابیە کان دا فلان کارم کردوو و ئینکاریان لی نەکردم لەسەری .

---

١-البخاری

البخاری : کتاب التیمم ( ١/٨٢ص )

## هەشتەم : فەرموودەی بچراو یان براو ( المقطوع )

لەرووی زمانەوانیەوە بە براو یان پچراو هاتووە ، دژی گەیاند یان پەیویست ،واتە( وصل ) یان ( متصل ) ، ئەم فەرموودەی کە درابیت پال تابعین یان شوینکەوتوان یان تابعی تابعین واتە شوین کەوتوی شوین کەوتوان ،یان کەسی تریشەوە .

هەروەها فەرموودەی ( منقطع ) جیاوازە لەگەل فەرموودەی ( المقطوع )

فەرموودەی ( منقطع ) جیاوازی لە سە نەدە کەیدا یە ، بەلام فەرموودەی ( المقطوع ) جیاوازی لە متنە کەی دایە .

هەروەها فەرموودەی ( المقطوع ) ئەویش ( المقطوع القولي ) هە یە : وەك قولی ( حەسنی بصری لە نویژ کردن لە پشت سەری بیدعە چیەوە : (( صل و عليه بدعته )) (١) نویژی لەبشت سەرەوە بکەن و بیدعەکەی بەسەر خویدا دەشکیتەوە .

هەروەها فەرموودەی ( المقطوع الفعلي ) وە ك : ( ابراهيم بن محمد بن المنتشر ) دە لي : (( كان مسروق يرخي السر بينه وبين اهله ، ويقبل عى صلاته و يخليهم و دنياهم )) (٢)

بەناوبانگی کتێبە کانی ( موقوف ) و ( المقطوع )

١-( مصنف ) ابن ابی شیبە .

٢-( مصنف ) عبدالرزاق .

٤-( التفسير ) ابن جرير .

٥-( التفسير ) ابن ابی حاتم .

٦-( التفسير ) ابن منذر .

---

١-البخاري ( ١/١٥٧ص ).

٢-حلية الأولياء ( ٢/٩٦ص ) .

## نۆیەم : فەرموودەی د رانە پال ( مسند )

ئەم فەرمودەیە لەرووی زمانەوانیەوە ، ئیمس مفعول لە ( اسند ) وە هاتووە ، بە مانای دان پال یان ئاماژە بۆ دان ، بەلی ئەم فەرموودەیە بە سەندەکەی پەیویست بیت وە بەرزکرابیتەوە بۆ لای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) (١)

نموونەی : ئەم فەرموودەیە کە بوخاری هیناویەتەوە دەلیت : ( عبدالله بن یوسف ) لە ( مالك ) وە ئەویش لە ( ابو الزناد ) و ە ئەویش لە ( الاعرج ) وە ئەویش لە ( ابو هریره )وە پیمان گەیشتووە کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : (( اذا شرب الكلب في أناء احدكم فليغسله سبعا )) (٢) واتە : ئەگەر سەگیك لە قاپیکتان دا ئاوی خورادەوە ، ئەوا حەوت جار بیشۆنەوە .

ئەگەر سەیری ئەم فەرموودەی ە بکەین لە سەرتاوە تاکۆتایی ( متصل ) پەیوەست بووە بەرزکراوەتەوە بۆ لای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) .

---

١- نخبه الفكر ( ابن حجر ).

٢-البخاری (٢/٤٧ ).

## دەیەم : فەرموودەی پەیوەست ( متصل )

ئەم فەرموودەیە لەرووی زمانەوانی ئیسمی فاعل واتە : ( اتصل ) گەیاند یان پەیوەست بوو ، گەیاند دژی پچرانە ، ئە م جۆرە فەرموودەیەش بە ( موصول ) ناو دەبریت .

هەروەها ئەم فەرموودەیە کە سەنەدەکەی ( متصل ) بیت یان پەیوەست گەیە نەر بیت ، ئیتر ( مرفوع ) و بەرزکراوە بیت ،یان ( موقوف ) و وە ستان بیت ، وە ئەم فەرموودەیە دەکریت بە دوو بەش :١- متصل المرفوع ٢- متصل الموقوف

نموونەی : ( متصل مرفوع ) وەك ئەوەیە کە ( مالك ) لە ( ابن شهاب ) وە ئەویش لە ( سالم بن عبدالله ) وە ئەویش لە( باوکیە ) وە ئەویش لە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بەوەی کە فلان شتی فەرمووە

نموونەی : ( متصل موقوف ) وەك ئەوەی کە ( مالك ) لە ( نافع ) لە ( ابن عمر )وە کە فلان شتی فەرمووە .

# ﴿فەرموودەی قودسی یان الحديث القدسي﴾

فەرموودەی قودسی لەرووی زمانەوایەوە ( القدس ) بەمانای ئاماژە بۆ لای ( قدس ) واتە : ( پاك- طهر ) ، ( پیرۆز – قدس ) واتە : فەرموودە کە دراوەتە پال زاتی پەروەردگار یان زاتی ( الله عز وجل ) ،ئەو فەرموودە قودسیانەی کە بۆ مان گۆزراونە تەوە ،کە دراوە تە پال ( خوای گەورە ) لە لایەن پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) .

## جیاوازی نێوان فەرموودی قودسی و قورئانی پیرۆز :

١-قورئانی پیرۆز ( لفظ و معنى ) واتە : ووتە و ماناکەی لە لایەن ( خوای پەروەردگارەویە ) بەلام فەرموودەی قودسی ( معنى ) یان ماناکەی لە لایەن ( خوای پەروەردگارەوەیە ) بەلام ( لفظ ) و ووتە کەی لەلایەن پێغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم )وە یە .

٢-خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز عیبادەت و پەرستن هەژمار دەکریت یان حیساب دەکریت ، بەلام فەرموودەی قودسی عیبادە ت و پەرستن هەژمار ناکریت یان حیساب ناکریت .

٣-قورئانی پیرۆز جیگیرە ( ثابت ) بوونیدا یە ، مەرجی گیراوە کە بە ( متواتر ) گیردرابیتەوە ، بەلام فەرموودەی قودسی بۆ جیگیربوونی ( متواتر ) بوون بە مەرج نە گیراوە .

٤-قورئانی پیرۆز هەر بەندەیەك پیتیکی لی بخوینیتەوە ( ١٠ ) چاکەی بۆ دە نووسریت ، بەلام خوینەوەی فەرموودەی قودسی ئەو ( ١٠ ) چاکەی بۆ حیساب ناکریت .

٥-قورئانی پیرۆز لە نویژدا دە خوینریت و کە رووکنیەکە لە روکنە کانی ئیسلام ،بەلام فەرموودەی قودسی لە نویژدا ناخوینریت.

٦-قورئانی پیرۆز تەحەدای موشریك و کافرانی پیکراوە ، بەلام فەرموودەی قودسی تەحەدای موشریك و کافرانی پی نەکراوە .

٧-قورئانی پیرۆز لە لایەن ( خوای گەورە )وە پاریزراوە ( حفظ ) کراوە ، بە لام فەرموودەی قودسی فەرموودەی لاواز و هەلبستراوە تیدایە .

بەلی فەرموودەی قودسی بە زۆی باسی ترسان لە ( خوای گەورە ) وە بەخشندەیی ( خوای گەورە ) تیدایە ، وە باسی ئەحکامەکانی شەرعی کەم تیدایە ،وە فەرموودەی قودسی بە ( قول ) و گوفتاری زۆر تیدایە ،ئەو دەربرینانەی کە لە فەرموودەی قودسیەوە هەن ئەمانەن :١- قال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) : قال الله تعالى . ٢- قال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) :فيما يرويه عن ربه عز وجل .

نموونەی : فەرموودەی قودسی : وەك ( مسلم ) لە صحيحه كەيدا لە(ابو ذر) ئەویش لە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ریوایەتی دەکات ، ئەویش لە ( خوای پەروەردگارەوە دەیگیریتەوە کە فەرموویەتی : (( يا عبادي اني حرمت الظلم على نسي و جعلته بينكم محرما فلا تظالموا ......)) . (١) واتە : ئەی بەندە کانم زولم و ستەمم لەسەر خۆ حەرام کردووە ، وە لە نیوان ئیوەشدا حەرامم کردووە ، بۆیە زلم و ستەم مەکەن .

هەر بۆیە فەرموودەی قودسی ژمارە یان زۆر نیە لە چاو فەرموودە کانی تری پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بەلام ژمارەی فەرموودە قودسەیە کان لە ( ٢٠٠ ) فەرموودە زیاترە ...!!

بە ناو بانگترین کتیب ی فەرموودەی قودسی :

١-( الاتحافات السنية بالاحاديث القدسية ) نووسە ر ( عبدالرووف المناوي ) کە ئە م کتابە ( ٢٧٢ ) فەرموودەی قودسی لەخۆ دەگریت .

١-مسلم بشرح ئيمام النواوى ( ١٣١/١٦ص ) ز

# ﴿زاراوەکانی زانستی فەرموودە یان مصطلح علوم الحدیث﴾

| | |
|---|---|
| علوم الحديث | فەرموودە ناسی |
| الحديث | فە رموودە |
| الخبر | هە وال |
| الأثر | شوینەوار یان ریچکە |
| السند | رشتە یان زنجیرە |
| المتن | تیکست یان دە ق یان نص |
| المحدث | فە رموودە ناس |
| المشهور | بە ناو بانگ |
| المستفيض | بلاوە بوو |
| العزيز | دەگمەن |
| معمول به | کار پی کراو |
| غير معمول به | کار پی نەکراو |
| الصحيح | ساغ و بی کەم و کوری |
| الأجماع | کۆ دەنگی |
| الحسن | جوان و شرین |
| المحتف بالقرائن | وەرگیراوی نیشاندار |
| المقبول | قبول وەرگیراو |
| ناسخ الحديث و منسوخ | سریاو سراوە |
| الخبر | هەوالی لادراو |
| الضعيف | لاواز |
| المرسل | نیردراو یان بەرەلاکراو |
| المعضل | ئالۆزاو |
| المنقطع | پچرا ،یان براو |
| المعلق | پەیوەند یان هەلپەسیراو |
| المدلس | فیل تی کراو |
| المرسل الخفي | نیردراوی شاراوە |
| المردود بسبب الطعن في الراوي | وەلامدانەوەی بەهۆی تانە لیدان لە گیرەرەوە |
| الفسق | پیس خراپ |
| المتبدع | بیدعە چی |
| الجهالة | نەفامی نەزانی |
| فحش الغلط | هەلەی زەق و زۆرو بیتام |
| سوء الحفظ | خرا پی هیزی لە بەر کردن |

| | |
|---|---|
| الغفلة | بى ئاگاى |
| كثرة الاوهام | زۆرى وەهم و خەيال |
| مخالفة الثقات | پيچەوانەبوونەوە لەگەڵ متمانەدارەكان |
| المنكر | فەرموودەى نەناسراو |
| المعروف | فەرموودەى ناسراو |
| المعلل | فەرموودەى عەييدار |
| المخالفة للثقان | دژايەتى كردنى متمانە پيكراوان |
| المقلوب | فەرموودەى وەرگيراو، يان قلبووە وە |
| المزيد في متصل الاسانيد | زيادە لە سەنەدى پەيوەست دا |
| المضطرب | فەرموودەى شلە قاو |
| المصحف | گۆڕينى ووشەيەك لە نيو فەرموودە كەدا |
| الشاذ المفوظ | فەرموودەى نامۆ و پاريزراو |
| الجهالة بالراوي | بى ئاگابوون لە حالى گيرە رەوە |
| بدعة | داهينان يان زيادە چى |
| سوء الحفظ | خرا پى هيزى لەبەر كردن |
| الحديث قودسي | فەرموودەى پيرۆزى خواى گەورە |
| المرفوع | فەرموودەى بەرز كراوە |
| الموقوف | فەرموودەى وەستينراو يان وەستاو |
| المقطوع | فەرموودەى پچراو يان براو |
| المتصل | فەرموودەى گەيەنەر يات پەيوەيست |
| زيادات الثقات | زيادەى كەسانى بروا پى كراو |
| العدالة | راست رەوەى يان راستى |
| من حدث و نسي | كەسيك فەرموودەى گيرايەوە بەلام لەبيرى چووتەوە |
| صيغ الاداء | شيوازە كانى گەياندن و دانەوە |
| صفة راوية الحديث | شيوازى گيرانەوەى فەرموودە |
| طرق لتحمل و صيغ الاداء | ريبازەكانى وەرگرتن و شيوازە كانى دانەوە |
| السماع من لفظ الشيخ | بيستن لە خودى دەربرينى ماموستاكەى |
| القراءة على الشيخ | خوينەوەى بەسەر ماموستاكەى |
| الإجازة | مولەت پى دان |
| المناولة | پى بەخشين |
| الكتابة | نووسينەوە |
| الإعلام | پى راگەياند |
| الوصية | وەسيە پى كردن |
| صفة راوية الحديث | شيوازى گيرانەوەى فەرموودە |

| | |
|---|---|
| الوجادة | بینینەوە یان دەست كەوتن |
| غريب الحديث | دەستەواژەی نامۆكانی نیو فەرموودەكە |
| لطائف الاسناد | جوانیە كانی رشتە |
| معرفة الرواة | ناسینی گیرەرەوەكان یان راویە كان |
| العالي و النازل | سەنەدی بەرز و نەزم |
| المسلسل | زنجیرەی پەیوەندی |
| رواية الاكابر عن الاصاغر | گیرانەوەی گەورە لە بچووك |
| راوية الاباء عن الابناء | گیرانەوەی باوك لە كور |
| رواية الابناء عن الاباء | گیرانەوەی كور لە باوك |
| المدبج و راوية الاقران | گیرانەوەی هاو تەمەن لە هاو تەمەن |
| معرفة الرواة | ناسینی گیرەرەوەكان |
| معرفة التابعين | ناسینی شوین كەوتوان |
| معرفة الاخوة والاخوات | ناسینی براو خوشكەكان |
| معرفة الصحابة | ناسینی هەوالان |
| المتفق | یەك دەنگ یان وەك یەك |
| المتفرق | جیاواز یان جودا |
| المهمل | ئیهمال كراو یان بە لاونراو |
| المبهمات | ناسینی شتە نادیارە كان |
| لقب | ناز ناو |
| معرفة التواريخ الرواة | ناسینی میژووی گیرەرەوەكان |
| طبقات الرواة | چینەكانی گیرەرەوەكان |
| معرفة الثقات والضعفاء من الرواة | ناسینی گیرەرەوە متمانە پی كراوە كان لاوازەكان |
| معرفة أوطان الرواة وبلدانهم | ناسینی وەلاتی و شاری گیرەرەوەكان |
| فقه | شەرع زانی |
| النبأ او أخبار | هەوال یان هەوالە كان |
| السقيم | نەساغ یان بە مانەی نەخۆش پیچەوانەی صحیح ساغ |
| الاصطلاح | زاراوە |
| حافظ | لە هەموو چینەكان دەی زانی واتە فەرموودەی زۆری لەبەرە |
| حاكم | ئەوەیە زانستەكەی زالە بەسەر هەموو فەرموودە كان |
| المصنف | كتیب |
| طبقة | چین |
| المعتمد | پشت پی بەستراو |
| ضبط | ریك و پیكی یان ریكخستن |
| حجة | بەلگە |

# ﴿بەناوبانگترین کتابە کانی فەرمووده ناسی علوم الحديث﴾

| كتاب | مؤلف |
|---|---|
| ١المحدث الفاصل بين الراوي والواعي | قاضي ابومحمد االحسن بن عبدالرحمن بن خلاد الرامهرمزي . سنة وفاة ٣٦٠هجري |
| ٢معرفة علوم الحديث | ابو عبدالله محمد بن عبدالله الحاكم النيسابوري. سنةوفاة ٤٠٥ هجري |
| ٣المستخرج على معرفة علوم الحديث | ابو نعيم احمد بن عبدالله الاصفهاني. سنةوفاة ٤٣٠ هجري |
| ٤الكفاية في علوم الرواية | ابو بكر احمد بن على بن ثابت الخطيب البغدادي . سنة وفاة ٤٦٣هجري |
| ٥ الجامع الاخلاق الراوي واداب السامع | الخطيب البغداي |
| ٦الماع الى معرفة اصول الرواية وتقييد السماع | القاضي عياض بن موسى اليحصبي . سنة وفاة٥٤٤ هجري |
| ٧مالا يسع المحدث جهله | ابو حص عمر بن عبدالمجيد اليا نجي ،سنة وفاة ٥٨٠ هجري |
| ٨علوم الحديث | ابو عمر و عثمان بن عبدالرحمن شاره زووري . ملقب : ابن صلاح شاره زووري . سنة وفاة ٦٤٣ هجري |
| ٩التقريب والتسير لمعرفة سنن البشير النذير | محي الدين يحيى بن شرف النواوي .سنة وفاة ٦٧٦ هجري |
| ١٠تقريب النواوي | جلا الدين عبدالرحمن بن ابي بكر السيوطي .سنة وفاة ٩١١ هجري |
| ١١نظم الدرر في علوم الأثر | زين الدين عبدالرحيم بن الحسين العراقي .سنة وفاة ٨٠٦ هجري |
| ١٢ فتح المغيث في شرح الفية الحديث | محمد بن عبدالرحمن السخاوي . سنة وفاة ٩٠٢ هجري |
| ١٣ نخبة الفكر في مصطلح اهل الاثر | الحافظ ابن حجر العسقلاني .سنةوفاة ٨٥٢ هجري |
| المنظومة البيقونية | عمر بن محمد البيقوني .سنة وفاة ١٠٨٠ هجري |
| ١٤قواعد الحديث | محمد جمال الدين القاسمي . سنة وفاة ١٣٣٢هجري |
| ١٥تيسير مصطلح الحديث | د. محمد الطحان |
| ١٦ زانستي زاراوه كاني فه رمووده ( تيسير مصطلح الحديث ) | وەرگێربۆ سەر زمانی کوردی ( مامۆستا عبدالله مەلا احمد ) |
| ١٧ پیگەی سووننە ت لەشەریعەتی ئیسلام | مصطفى السباعي / وەرگێر بۆ زمانی شیرینی کوری ( ماموستا عبدالكريم فتاح . |

## ﴿سەرچاوەکان﴾


١- زانستي زاراوە کاني فە رموودە (تيسير مصطلح الحديث).

٢-نزهة النظر في توضيح نخبة الفكر (ابن حجر العسقلاني ) تحقيق (ناصر بن الطبري)

٣-صحيح البخاري كتاب وضوء (محمد بن اسماعيل ).

٤-صحيح المسلم (مسلم ابن الحجاج )

٥-تيسير مصطلح الحديث (د. محمد الطحان )

٦-حلية الاولياء (ابو نعيم

٧-شرح نزهة النظر (ملا علي القاري ) تحقيق (محمد نزار تميم )

٨-شرح الزرقاني على البقونية (محمد عبدالباقي الزرقاني )

٩- علوم الحديث (ابن صلاح )

١٠-معرفة علوم الحديث (ابو عبدالله الحاكم ) تحقيق (سيد معظم حسين) .

١١-الكفاية في علوم الرواية (خطيب البغدادي )

١٢-الحديث الضعيف وحكم الاحتجاج به (عبدالكريم خضير ).

١٣-اختصار علوم الحديث (الحافظ ابن كثير ) تحقيق (ماهر الفحل )

١٤- النكت على نزهة النظر (على الحلبي )

١٥- المعجم الاوسط (الطبراني )

١٦- مسند الامام احمد . تحقيق (شعيب الارناووط )

١٧-تاريخ البغداد (خطيب بغدادي ) تحقيق (بشار عواد)

١٨-صحيح البخاري كتاب الجهاد.

١٩-صحيح مسلم كتاب الجهاد

٢٠-سنن ابو داود

## ناوه رۆك